# ئامۆژگاری

## لە (١٠٠٠) چیرۆکی ڕاستەقینەدا

مەلا عەبدوالخالق حەسەن شوانی

چاپی سێیەم
٢٠٠٩
هەولێر





## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : ئامۆژگاری لە (١٠٠٠) چیرۆکی راستەقینەدا
بابەت : ئایینی
ئامادەکردنی     مەلا عەبدولخالق حەسەن شوانی
کۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا
چاپی : چاپی یەکەم/ ٢٠٠١     چاپی دووەم /٢٠٠٧     چاپی سێیەم/ ٢٠٠٩
شوێنی بلاوکردنەوە: (( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٢)ی ساڵی(٢٠٠٧)ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده والصلاة و والسلام على من لا نبي بعدَه و على اله أصحابه الى يوم لا يوم بعده.... أما بعد:-

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان، درووود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان (ﷺ) هەروەها سەرجەم باوەڕداران، ئەی موسڵمانی دڵ ڕەوشەن، ئەم پەرتووکەی بەردەستت، دەرم هێناوە لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر و پەرتووکە چیرۆکیەکان.

**مەلا عەبدولخالیق شوانی**

- **١- قسە نەکردن و دڵ شکان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: دەرگەی بەهەشت لە هەموو ڕۆژانی دوشەممە و پێنج شەممەیەك دەکرێتەوە، داوای لێ خۆشبون دەکا بۆ ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە، جگە لە بەندەیەك کە تاکو چاك دەبێتەوە لەگەڵ برادەرەکەی ! بنوارنە ئەم دوو ناکۆکە تا چاك دەبنەوە ! بنوارنەوە ئەم دووە تاکو چاك دەبنەوە.
- **٢- لێ خۆشبوون: دەگێڕنەوە:** ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری یارانی دەکرد فەرمووی: لە پێش ئێوە پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو، هەرکەسێ داوای، پارەی قەرزی لێ بکردبوایە مۆڵەتی بۆ دادەنا، ئینجا کەساتی وەرگرتنەوە دەهات لێی خۆش دەبوو، خودا حیسابی لەگەڵ کرد فەرمووی: ئەی فیسار ! مادەم تۆ لە ژین لەبەندەکانی من خۆش دەبووی ! ئەوا منیش هەنوکە لێت خۆش بووم !
- **٣- عەتاءلە ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە:** دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕابوورد بەلای دەستەیێك لە یارانیدا، حەزرەتی عومەریشیان تیادابوو، فەرمووی: ئایا ئێوە بە ڕاستی خاوەن باوەڕن،؟ کەسێ وەلامی نەدایەوە، عومەر فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دروشمی بڕواتان چیە ؟ فەرمووی لە کاتی خۆشی سوپاسی خودا دەکەین و لە تەنگانە ئارام دەبین، ڕەزامەندین بە قەزا و قەدەر، پێغەمبەر فەرمووی سوێند بەخودا بڕواداران.
- **٤- پشت بەستن بە خوا:** ترمزی دەڵێ: عەرەبێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! بەوشتر هاتوم، پشت بە خودا بەرەڵام کردوە وازی لێ نەهێنم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەء ببەستەوە: ئینجا پشت بە خودا ببەستە! (گفتەی ت.).
- **٥- نان بدەیی: دەگێڕنەوە:** پیاوێ لە پێغەمبەری (ﷺ) پرسی: چ شتێ لە ئاینی ئیسلامدا زۆر چاکە،؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نان بدە و سلاویش لە هەموو کەسێ بکە، بیناسی، یا نەیناسی (گفتەی ب م.).

- **٦- کارکردن: دەگێڕنەوە:** جارێ کۆمەڵە کەسێ هاتنە خزمەتی پێغەمبەر یەکێکیان عەرزی کرد: فیسارەکەس هەمیشە خەریکی نوێژ و ڕۆژو و قورئان خوێندن و ناوبردنی خودایە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەی کێتان نان و ئاوێکی بۆ پەیدا دەکات ؟ خەڵکەکە گوتیان هەمووومان: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەمووتان لەو باشترن!
- **٧- کردەوەی چاك: دەگێڕنەوە:** یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ! چ کردەوەیەك باشە،؟ فەرموی: بڕوا بە خوا و پێغەمبەر، گوتیان لە پاش ئەمە چی، ؟ فەرمووی: خەبات لە پێناوی ئایین، گوتیان پاش ئەمە چی،؟ فەرمووی: چوون بۆ ماڵی خوا بە پارە و دراوێکی ڕەوا....
- **٨- درۆکردن: دەگێڕنەوە:** گوتیان: ئەی پێغەمبەری (ﷺ) خوا ! ئایا بڕوادار ترسنۆك دەبێ،؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: ئایا بڕوادار ڕژد دەبێ ؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان ئایا بڕوادار درۆزن دەبێ ؟ فەرمووی نەخێر!.
- **٩- چاکترین دۆست: دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ! شایەنترین کەسێ کێ یە بۆ دۆستایەتیم،؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دایکت، فەرمووی لە پاشان، فەرمووی: دایکت، فەرمووی لە پاشان ؟ فەرمووی باوکت، فەرمووی لە پاشان ؟ فەرمووی: ئەوبەرتر و ئەم بەر تر. (گفتەی ب م .)
- **١٠- نزیکترین هاوسێ: دەگێڕنەوە:** عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ! من دوو هاوسێم هەیە دیاری بۆ کامەیان بەرم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بۆ ئەوەیان کە دەرگەکەی نزیکترە لێت (گفتەی ب م.)
- **١١- زەکات بەسەید ناشێ: دەگێڕنەوە:** جارێ حەسەنی پێشەوا عەلی دەنکە قەسپێکی هەڵگرتەوە لە قەسپی زەکات، بردیە نێو دەمی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کخ، کخ، تفی کەرەوە ئایا نازانی زەکات بە ئێمە ناشێ !!!!...... (گفتەی ب م).
- **١٢- بێ دڵی نەکردنی نەخۆش: دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دیدەنی نەخۆشێ چوو فەرمووی: مەرەقت لە چی یە،؟ فەرموی مەرەق و ئارەزووم نانی گەنمە. فەرمووی: هەر کەسێ نانی گەنمی لایە بابۆی بهێنی لە پاشان فەرمووی: نەخۆشەکانتان ئارەزووی

شتێکیان کرد بۆیان پەیدا بکەن ! (گفته ابن ماجه).

- ١٣- **ئارەق دەردە: دەگێڕنەوە:** جارێ پزیشکێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری (ﷺ) خوا ! دەمەوێ ئارەق بکەمە نێو دەرمانی نەخۆشان بۆ چارەسەریان ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئارەق دەرمان نیە ! بەڵکو دەردە! (گفتەی م ب).
- ١٤- **جوێن دان بە گرانەتا تاوانە: دەگێڕنەوە:** جارێ باسی گرانەتایان کرد لە لای پێغەمبەر پیاوێ جوێنی بە گرانەتا دا ! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جوێن بە گرانەتا نەدەن، چونکە گرانەتا لەناو بەری تاوانە، هەروەك ئاگر لەناوبەری ژەنگو پیسی ئاسنە.... (گفته م .)
- ١٥- **کرنۆش بردن بۆ خوایە: دەگێڕنەوە:** جارێ سەلمانی فارسی ویستی کرنۆش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ببا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی نابێ کەس کرنۆش بۆ کەس ببا. ئەگەر فەرمانیشم پێ بکرابوایە، یەکێ کرنۆش بۆ یەکێ ببا، ئەوا فەرمانم ئەکرد، ژن کرنۆش بۆ مێردەکەی ببا! (گفته. ب).
- ١٦- **خزمەت کردنی خێزان: دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: دینارێ بەخت بکەی لە پێناوی خودادا دینارێ بەخت بکەی لە پێناوی هەژارێدا و دینارێ بەخت بکەی لە پێناو خێزانەکەتدا. ئەوەی لە پێناوی خێزانەکەت بەختت کردووە پاداشتی لە هەمووان پترە (گفته ب ).
- ١٧- **چرای شەو: دەگێڕنەوە** لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)ماڵێك لە مەدینەدا ئاگری گرت و سووتا کاتێ ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر گەیشت فەرمووی: بەڕاستی ئاگر دوژمنە. جا ئەگەر کاتێ خوازتتان بخەون بیکوژێننەوە. (گفتەی ب.)
- ١٨- **مەلای نوێژ درێژ:** دەگێڕنەوە: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر سکاڵای نوێژ درێژی مەلایەکی کرد لە نوێژی بەیانیدا، فەرمووی: لەترسی درێژی نوێژەکەی خۆم دوا دەخەم. پێغەمبەر ڕق و قینی ئاوای لێ نەدیترا بوو فەرمووی: ئەی خەڵکینە ! کە پێش نوێژی دەکەن با نوێژەکان کورت بن، چونکە پاش نوێژەکان هەمەڕەنگن، تەمەندارن، کاردارن، زامدارن.

**١٩- گەورەیی قل هو الله احد: دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ یادی خوای دەکرد بە سورەی (الاخلاص) یەکێ گوێی خۆی لێ ڕاگرتبوو بەیانی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) چوو فەرمووی: فیسار هەمیشە خەریکی خوێندنی (قل هو اللە احد)ە، پیاوەکەش لەناکاو پەیدا بوو خەریکی خوێندنی (قل هو اللە احد) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەو خودایەی کە گیانی منی لە دەستایە بە ڕاستی (قل هو اللە احد) سێ یەکی قورئانی پیرۆزە. (گفتە بە . م .)

- **٢٠- پێغەمبەر** ئامۆژگاری عەلی دەکا: دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) جارێ بە پێشەوا عەلی گوت: ئەی عەلی ! سێ شت کە کات و ساتیان هات دوایان مەخە: نوێژ کە کاتی هات، تەرم کە ئامادە بوو، کچ کە هاوچەشنی بۆ پەیدا بوو.
- **٢١- خێر کردن: دەگێڕنەوە:** عائیشە دەڵێ: کاوڕێکمان سەربڕی هەموو گۆشتەکەمان بۆ خەڵك نارد: جگە لە شان و پیلی کاوڕەکە . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چیتان بۆ خۆمان جێ هێشتووە ؟ عائیشە گوتی: تەنها پیلەکە، پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر هەمووت بۆ خۆمان گێڕایەوە پیلەکە نەبێ! (گفتە ب).
- **٢٢- تورەو توندی: دەگێڕنەوە:** پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا: بە ڕاسپێری چاکەم، پێغەمبەر فەرمووی: تورە و توند مەبە، پیاوەکە چەند جارێ ئەم پرسیارەی دووبارە و سێ بارە دەکردەوە، بەڵام قسەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئەمە بوو کە دەیوت: تورە و توند مەبە. (گفتە .ت.)
- **٢٣- خۆش ویستنی خوا و پێغەمبەر: دەگێڕنەوە:** پیاوێ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ! کەی جیهان وێران دەبێ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردووە ؟ پیاوەکە فەرمووی: خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ لەگەڵ خۆشەویستەکانتی کە خواو پێغەمبەرن. (گفتە م).
- **٣٤- دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر ڕۆژێ حەسەنی ئیمامی عەلی لە ماڵ بردە دەرێ سەری خستە سەر مینبەر، فەرمووی: ئەمە کوڕی منە، سەیدە، گەورەیە، ئومێدەوارم کە خوا بەهۆی ئەمەوە مەسرەتی بخاتە نێوان دوو دەستەی موسوڵمان (گفتە ب)

- **٢٥- نوستنی پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە** لە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ دەیویست بخەوێ دەستی ڕاستی لە ژێر روخساری دادەنا، لە پاشان دەیفەرموو: (اللهم قنی عذابك یوم تبعث عبادك)....گفته . ت . ابن ماجه.)
- **٢٦- زکری سبحان الله: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێ هەموو بەیانی و ئێوارەیەك سەد جار بڵێ (سبحان الله و بحمده) کەسێ چاکەیەکی چاکتری لانییە وەك چاکەی ئەو. مەگەر ئەوەی ئەم زکرەی کردبێ یا پتر لە ژمارەی ئەم زکرە! (گفته . م .)
- **٢٧- رایەخی پێغەمبەر: دەگێڕنەوە** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر رایەخێکی حەسیر پاڵی دابووەوە، کەلەکەی شووی بەست بوو، لەبەر دڕی حەسیرەکە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: بۆچی ڕایەخێکی نەرمت بۆ دروست نەکەین! پێغەمبەر فەرمووی: من چ کارم بە جیهان نییە ! من لە جیهان وەك سوارێکم لە ژێر سێبەری درەختێ پشووبدا و لە پاشان جێی بهێڵێ. (گفته . ت .)
- **٢٨- خۆراکی پێغەمبەر: دەگێڕنەوە:** جارێ ئەبو هورەیرە بە کەناری هەندێ پیاو تێپەڕی خەریکی خواردنی گۆشت بوون. بانگیان کرد وەڵامی نەدانەوە. فەرمووی پێغەمبەری خوا کە لە جیهان دەرچوو تێری نانە جۆ نەخوارد ! جا چۆن من خەریکی گۆشت خواردن بم !!! (گفته . ب-.
- **٢٩- ڕاستە لە ئیسلامەتی دا: دەگێڕنەوە:** جارێ هەندێ شەربەتیان دا پێغەمبەر (ﷺ) نۆشی کرد، منداڵێ لە دەستە ڕاستی بور هەندێ جوامێر و پیرەمێرد لە دەستە چەپی بوون، پێغەمبەر بە منداڵەکەی فەرموو: ئایا ڕێم دەدەی ئەم شەربەتە بدەمە ئەم جوامێرانە؟ منالەکە گوتی: نەء ئەی پێغەمبەر: بەشی خۆم نادەم بە کەس، جگە لە خۆت، پێغەمبەریش دایە دەستی.
- **٣٠- بێ فیزی پێغەمبەر: دەگێڕنەوە:** (ئەنەسی کوڕی مالیك) کاتێ بەلای منداڵان تێدەپەڕی سلاوی لێ دەکردن، دەیفەرموو: ئەمە کردەوەی پێغەمبەر بوو. (گفتەی ب).
- **٣١- هەڵس ڕ کەوتی پێغەمبەر لە ماڵ دا: دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لە عائیشە کرد ئایا پێغەمبەر لە ماڵ دا چی دەکرد ؟ فەرمووی: خەریکی خزمەت کردنی خێزان دەبوو تا کاتی

نوێژ، کاتی نوێژ بۆ نوێژ دەچوو.

- ٣٢- **دەعیە چۆنە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: یەکێ ئەندازەی توسقاڵە زەڕڕەیەك فیزی لە دڵ بێ ناچێتە بەهەشت پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەر، پیاو پێی خۆشە پۆشینە و پێتاوی جوان بن؟. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی خوا جوانە و جوانانیشی خۆشدەوێ، فیز و دەعیە سەرکێشی یە لە هەق و بێ نرخ کردنی مرۆڤە. (گفتە م د. ت).
- ٣٣- **ئایین سانایە: دەگێڕنەوە:** جارێ عەرەبێ میزی لەناو مزگەوت دا کرد، خەڵکەکە لێی هەڵسانە سەر پێیان، پێغەمبەر فەرمووی: لێی گەڕێن هەڕەشە و گوڕەشەی لێ مەکەن، شوێنی میزەکە بەئاو خاوێن بکەنەوە، خوا منی بۆ ئاسانکاری ناردووە نەك بۆ گرانکاری و سەختکاری.
- ٣٤- **ئەوانەی شیاوی گەورایەتی نین: دەگێڕنەوە:** جارێ (ئەبو موسای ئەشعەری) و دوو ئامۆزای چوونە لای پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکیان فەرمووی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتومە لات بمکەی بەکار بەدەست، ئەوی تریش هەمان پرسیاری کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەخودا یەکێ داوای کاربەدەستایەتی بکا، یا ڕشت و سوور بێ لەسەری ناهێڵم توخنی کار بە دەستایەتی بکەوێ.
- ٣٥- **ئەندازەی نوێژ و وتاری هەینی: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نوێژی درێژ، وتاری کورت، نیشانەی مەلایەتی یە، فەرمووی نوێژتان درێژکەن و وتار تان کورت بکەن.
- ٣٦- **سوپاسی پێغەمبەر بۆ خۆراك: دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە خێزانەکانی: چیمان هەیە ؟ گوتیان: جگە لە سرکە چیترمان نییە. فەرمووی بیهێنن. هێنایان پێغەمبەر (ﷺ) سرکەکەی دەخوارد و دەیگوت: چاکترین پێ خۆر، سرکەیە، چاکترین پێ خۆر سرکەیە (گفتەی م. د.ن.ت)
- ٣٧- **چۆنیەتی چوونە مالآن: دەگێڕنەوە:** (کیلدەی کوری حەنبەل) جارێ چووە ماڵی پێغەمبەر، بەڵام سەلامی نەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بگەڕێوە بڵێ (السلام علیکم)

بێمە ژوورەوە کەواتە چۆنییەتی چوونە مالأن بەم جۆرە یە.

- **٣٨- چۆنیەتی چاوپێکەوتنی برادەران: دەگێڕنەوە**: پیاوێ گوتی:ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ): یەکێ چاوی بە دۆست و بـرادەری کـەوت: ئایـا لـەبـەری بـچەمێتەوە ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: نەء، پیاوەکە فەرمووی: ماچ ماچ و دەس لـەملانە بکەن؟ فەرمووی: نەء، پیاوەکە فەرمووی تەوقە لـەگەڵ یەکتر بکەن ؟ پێغەمبەر فـەرمووی: (بـەڵێ) .(گفتـەی ت. ماجە ئەحمەد).
- **٣٩- مافی موسوڵمانان: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: مـاف موسـڵمان لەسـەر موسـڵمان پێنج شتە وەڵام دانەوەی سـڵاو، سـەردانی نـەخۆش، بەدواکـەوتنی تـەرم، وەڵام دانەوەی بانگی نان خواردن، نزاکردنی بۆ پێ کژیوو. (گفتەی ب.م.).
- **٤٠- بەزەیی هاتنەوە: دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر (ﷺ) (حەسەنی ئیمامی عەلی) ماچ کـرد، (ئەقرەع) گوتی: من دە منالّم هەیە، تا ئێستا یەکێکیانم ماچ نەکردوە، پێغەمبەر لـە وەڵامـی دا فەرمووی: یەکێ بە زەیی بە خەڵکا نەیەت، خوداش بەزەیی پـێ نایـەت (گفتـەی. ب .م).
- **٤١- نزایە گیراکان: دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سێ نزا و پاڕانەوە بەبێ گومان گیران: نزای زۆر لـێ کراو، نزای ڕێبوار و نزای باوك بۆ منداڵ (گفتەی ت. د).
- **٤٢- چاکترین کەس: دەگێڕنەوە** لە (عەبدوڵڵای ئیمامی عومەر) لە سـەردەمی پێغەمبـەردا لە نێوان خۆیان کاتێ باسـی چـاترین کەسـیان دەکـرد لـە پێـشیدا، ئیمـامی ئەبوبـەکریان ناودەبرد ئینجا ئیمامی عومەر، ئینجـا ئیمـامی عوسمـان، ئینجـا ئیمـامی عـەلی (ر خ) (گفتەی ب)
- **٤٣- گەورەیی ژن لە ئیسلامەتی دا: دەگێڕنەوە**،عائیشە فەرمووی: (ژنێ لـەگـەڵ دوو کـچ هاتە لام بۆ دەرۆزە،جگە لە دەنکە خورمایێ چـیترم لانـەبوو، خورماکەشـم پێـدا، ئـەویش خورماکەی بەش کرد لـە نێوان دوو کچەکەدا، پاشان هەڵساو ڕۆیـشت، پێغەمبـەر (ﷺ) هاتەوە ئەم هەواڵەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی یەکێ خوا کـچی پـێ بـدا و لـەگـەڵیان جـوان هەڵس و کەوت بکا، دەبنە پەردە لەنێوان و ئەو و ئاگردا.

• **٤٤- هاوسێ ی خراپ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەخوا بێ بڕوایە، بەخوا بێ بڕوایە، بەخوا بێ بڕوایە! وتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا !؟ فەرمووی ئەو هاوسێیەی خەڵك دڵنیانییە لە هەڵس و کەوتی ! (گفتەی .ب. م).

• **٤٥- چۆنیەتی هەڵس و کەوتی موسوڵمان و کافر:** دەگێڕنەوە: لە ئەسمای کچی ئەبوبەکر، دایکی هاتە سەردانی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام بێ بڕوا بوو، فەرمووی چوومە لای پێغەمبەر گوتم: دایکم بۆ دیدەنیم هاتووە، چاکە و هاوکاری لەگەڵ بکەم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ چاکەی لەگەڵ بکە . (گفتە .ب. م).

• **٤٦- قسە شکاندنی باوك: دەگێڕنەوە:** عەبدوڵڵای ئیمامی عومەر ژنێکی هەبوو زۆری خۆشدەویست، بەڵام باوکی ڕقی لێ دەبووەوە، فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا بەرەڵڵای بکە، عەبدوڵڵاش دەڵێ گوتم: بەرەڵڵای ناکەم، ئیمامی عومەر چووە لای پێغەمبەر و، پێغەمبەر فەرمووی، با بەرەڵڵای بکا . (گفتەی . د. ت.).

• **٤٧- خۆش ویستن لەبەر خودا: دەگێڕنەوە:** پیاوێ لەتەك پێغەمبەر بوو (ﷺ) پیاوی بەلایان ڕابوورد، پیاوەکەی تەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەر: ئەی پێغەمبەر ! من ئەو پیاوەم زۆر خۆش دەوێ، پێغەمبەر فەرموی: خۆش ویستنەکەت لادرکاندوە ؟ فەرمووی:نەء پێغەمبەر فەرمووی: بڕۆ پێ ی بڵێ، ئەویش چوو پێ ی گوت، پیاوەکەش گوتی خوا خۆشتی بوێ، کە منت لەبەر ئەو خۆش دەوێ.

• **٤٨- قووڵی دۆزەخ: دەگێڕنەوە:** جارێ یاران لە تەك پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبون کاتێ دەنگێکی گەورە هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن ئەم دەنگە چی بوو ؟ گوتیان خوا و پێغەمبەر شارەزاترن، فەرمووی: ئەمە دەنگی بەردێك بوو هەفتا ساڵە تێیان هەڵداوەتە نێو دۆزەخ و هەنووکە گەیشتە بنی، ئەمەش دەنگەکە بوو.

• **٤٩-سێ نزای پێغەمبەر (ﷺ) لە خودا: دەگێڕنەوە:** لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی داوای سێ شتم لە خوا کرد، دوانیانی پێ بەخشیم، یەکێکیانی پێ نەبەخشیم، بەخشراوەکان: پاڕامەوە لەخوا گەلی من بە گرانی گشتی گیرۆدە نەکا، پێی بەخشیم . پاڕامەوە لە خودا گەلی من لەناو نەبا بە لافاوی گشتی پێی بەخشیم: پاڕامەوە خوا جەنگ و فرتێنە نەهێڵێ

لەناو گەلی من پێی نەبەخشیم.

- ٥٠- **زۆرترینی نزای پێغەمبەر: دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لە ئوموسەلەمە کرد زۆرترین نزا و پارانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) چی بوو کاتێ کەلای تۆ دەمایەوە ؟ فەرمووی (یا مقلب القلوب ثبت قلبي علي دينك- (گفتەی . ت).
- ٥١- **زانستی موسلمانان: دەگێڕنەوە:** هارونە رەشیدی پاشای عێراق، کات ژمێری دەستکردی خۆیانی بۆ پاشای ولاتی ئینگلیز بە دیاری رەوانە کرد، کاتێ ئینگلیزەکان سەیری کات ژمێرەکەیان کرد گوتیان: ئەم کاتژمێرە شەیتانۆکەی تیادایە!!!
- ٥٢- **لێبووردنی پێغەمبەر (ﷺ):دەگێڕنەوە:** جارێك پێغەمبەر لە یەکێك لە جەنگەکان لەژێر سایەی درەختێ پشوو دەدات و جلەکانی بەلق و پۆپی درەختەکەوە هەلدەواسێت، لەپاش کەمێك بێ باوەڕێ بەخۆ و بە شمشێرەوە دەردەکەوێت دەلێت: ئەی محەمەد ! کێ هەیە لە دەست من ڕزگارت بکات، پێغەمبەر دەلێت: خودا!. بێ باوەڕەکە شمشێرەکەی لە دەست دەکەوێتە خوارەوە و پێغەمبەر (ﷺ) شمشێرەکە هەلْ دەگرێتەوە و دەلێت: تۆ کێ ڕزگارت دەکات لە دەست من ؟ بێ باوەڕەکە دەلێت: بەزەییت، پێغەمبەر لێی دەبوورێت، ئەویش موسولمان دەبێت.
- ٥٣- **هیچ شت لە خودا بزر نی یە :دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا عومەر بە شوانێکی گوت: مەڕێکم پێ بفرۆشە و بە گەورەکەت بلێ گورگ خواردی، شوانەکە گوتی: ئەی لەلای خودا چی بلێم ؟ ئەی پێشەوا عومەر، هیچ شت لە خودا بزر نیە، ڕۆژی دووهەم بۆلای گەورەی شوانەکە چوو و ئازادی کرد!
- ٥٤- **ترسی پێشەوا عومەر لە قورئان: دەگێڕنەوە** جارێك پێشەوا عومەر (خوای لێ رازی بێت) هاتووچۆ دەکات لەنێو مالە هاوەلەکان، لەپاش کەمێك گوێی لە دەنگی قورئان خوێندنێك دەبێت، کە سورەتی (الطور) دەخوێنێ، ئەویش گوێی بۆ شل دەکات، تا دەگاتە ئایەتی (ان عذاب ربك لواقع- لەبەر ترسی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەرز دەیگرێ و بۆ مالەوە دەچێتەوە، لەبەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە مانگێك لە مالەوە نەخۆشی دەکەوێت!!!
- ٥٥- **باوکی بووخاری ڕەوا خۆر بووە: دەگێڕنەوە:** ئیسماعیلی باوکی پێشەوا بوخاری

لەسەرە مەرگیدا ڕووی لە ئامادە بووەکان کرد و گوتی: بەخودا، گومان نابەم کە خۆراکی نارەوام خواردبێت.

- ٥٦- **خۆگرتنی بوخاری لەکاتی نوێژدا: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا بوخاری نوێژ دەکات لەناو نوێژەکەیدا زەنگە سۆرەیەك (١٧) جار پێوەی دەدات، بەڵام ئەو نوێژەکەی نابڕێت.
- ٥٧- **بەزەیی هاتنی عومەر بە گیانداران: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا عومەر(خوای لێ رازی بێت) لە قرچە قرچی گەرمادا، لەبەر هەندێ ئاژەڵ دەبێت، بەڵام لەبەر سەختێتی گەرماکە ئاژەڵەکان دەباتە بەر سێبەرێك و دەڵێت: سوێند بە خودا ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) مابوایە ئاوای دەکرد.
- ٥٨- **زگی پێشەوا عەلی سەری خۆراکە و ژێری زانستە:** دەگێڕنەوە: جارێك پێشەوا عەلی لە نێو بازێڕدا دەسوڕێتەوە هەندێ کەس پێی دەڵێن (بزرك شكم) واتا: زگ گەورە، رستەیەکی فارسیە، پێشەوا عەلیش دەڵێت: سەری خۆراکە و ژێری زانستە !!!
- ٥٩- **یەکێ لەنازناوەکانی پێشەوا عەلی ئەبوتورابە: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا عەلی دڵی لە فاتیمەی خێزانی تۆزێ دەرەنجێ، لە ڕکان دەچێتە ژێر دیواری کەعبە، سەر زگی پڕ خۆڵ دەکات، پێغەمبەریش ئەم هەواڵە دەزانێت، دەچێتە لای و دەڵێ: هەستە ئەبو توراب.
- ٦٠- **گۆڕستان چاترین دانیشگایە: دەگێڕنەوە:** جارێك کۆمەڵێك پیاو بۆ گلەیی و گازاندە دەچنە لای هارونە ڕەشیدی پاشای عێراق،لەبەر ئەوەی بە هلولی برای هەمیشە لەسەر گۆڕستانە، هارونە ڕەشیدیش بانگی بەهلول دەکات و دەڵێت: باشە لەبەر چی هێندە دەچیە سەر گۆڕان ؟ ئەویش دەڵێت: ئەگەر لە لایان دانیشم ئازارم نادەن، ئەگەر بڕۆم بە خراپە باسم ناکەن!!!
- ٦١- **بەهەشت بەنۆرەیە: دەگێڕنەوە:** جارێك بایەزیدی بەستانی بۆ گەرماوێك دەچێت بەبێ ئەوەی نۆرە بگرێت، کابرای گەرماو چی دەڵێت برا چوونە ژوورەوە بە نۆرەیە ؟ بایەزید دەڵێت: ئەی هاوار ! بەهەشت چۆن بێ نۆرە دەبێت.
- ٦٢- **مەزەندەی چاك: دەگێڕنەوە:** مالیکی کوڕی دیناریان لە خەودیت خودای گەورە چی لەگەڵ کردی ؟ گوتی: لە تاوانەکانم خۆشبوو لەبەر مەزەندەی چاکم بەرامبەریان.

- **٦٣- یاد کردنی مەرگ دڵ نەرم دەکا :دەگێڕنەوە:** ژنێك هاتە لای عائیشە سکالاًی دڵ ڕەقی خۆی بۆ کرد، عائیشەش گوتی: زۆر یادی مەرگ بکە دڵت نەرم دەبێت، ئەویش بە گوێی کرد لە پاش ماوەیەك دڵی نەرم بوو.
- **٦٤- خەباتی ژنە موسڵمان : دەگێڕنەوە:** عائیشە گوتی: ئەیپێغەمبەری خودا (ﷺ) ژن خەباتیان لەسەرە !؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ خەباتی بێ جەنگە، حەج و عەمرەیە.
- **٦٥-حەجی پەك کەوتە : دەگێڕنەوە** پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ! باوکم پیرە ؟ دروستە بۆم لە جیاتی ئەو حەجی بۆ بکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ . (گفتە. ت. ن).
- **٦٦- چاکێتی پێشەوا حەسەن لەگەڵ دایکی دا : دەگێڕنەوە:** حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی خواردنی لەگەڵ دایکی نەدەخوارد، ڕۆژێك دایکی پرسیاری لێ کرد، بۆچی نانم لەگەڵ ناخۆیت ؟ گوتی: دایە دەترسم لەکاتی خواردنمان دەست بۆ شتێ ببەم، تۆ دڵت لەسەری بێت.
- **٦٧- عائیشە و جولەکەیەك : دەگێڕنەوە:** عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: جارێك جولەکەیەك کاری پێم بوو، منیش بۆم ئەنجامدا، ئەویش گوتی: خودا لە سزای گۆڕ دەت پارێزێ ! منیش ئەم قسەیەم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەر فەرمووی ڕاست دەکات.
- **٦٨- (سبحان الله ) یەك لە سامانی سولەیمان چاکترە : دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێك بەلای سامانی سولەیمان پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی، لەبەر زۆری سامانەکە گوتی: سبحان اللە، (با) ئەم قسەیەی بردە ناو گوێی سولەیمان و سولەیمان گوتی: بەخودا ئەمە چاکترە لە سامانی سولەیمان !!!
- **٦٩-دەرۆزەکەری بازرگان : دەگێڕنەوە:** جارێك دەرۆزەکەرێك هاتە لای پێشەوا عومەر و کۆمەڵێك یار، گوتی کامەتان ئیمشەو ڕام دەگرن ؟ پێشەوا عومەر فەرمووی: من، بەلاًم ئەو تورەگەیەت چی تیادایە ؟ گوتی خۆراك، ئەویش هەمووی لە پێش ولاًخی زەکات

ڕووکردوو گوتی تۆ بازرگانی، نەك هەژار !!.

- **٧٠- دەگێڕنەوە کاتێ** (سەعدی مەعاز) مەرگی خودای بەجێ هێنا (٧٠) هەزار فریشتە ئامادەی ناشتنی تەرمەکەی بوون، تەختی خودا لەرزی، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هێشتا لە گوشینی گۆڕ ڕزگاری نەبووە.

- **٧١- ئازایەتی پێشەوا عەلی: دەگێڕنەوە:** لە جەنگی خەیبەردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عەلی ! تۆ ئاگات لە ماڵ بێت ؟ پێشەوا عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! لەنێو ژن و منداڵان بم.

- **٧٢- وەرعی پێشەوا ئەحمەد: دەگێڕنەوە:** پێشەوا ئەحمەد کاڵەکی نەدەخوارد پرسیاریان لێ کرد قوربان بۆچی کاڵەك ناخۆیت ؟ گوتی: نازانم پێغەمبەر چۆنی خواردووە، بە پەلکەوە یا بێ پەلك!.

- **٧٣- سەرزەنشت دەریا پیس دەکات: دەگێڕنەوە:** عائیشەی خێزانی پێغەمبەر لەلای پێغەمبەر باسی کورتە بالآیی سەفیەی کرد، پێغەمبەر فەرمووی ئای، ئای، عائیشە ئەم تاکە قسەیەی تۆ، ئەگەر تێکەڵ بە ئاوی دەریا بکرێت گەندە دەبێت.

- **٧٤- هەر عومەری جارانم: دەگێڕنەوە:** جارێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز تیشکی چرا کز دەبێت، دەچێت زیادی دەکات و دێتەوە جێی خۆی خەڵکەکەی دەورووبەری دەڵێن: قوربان بۆچی خۆت هەستای بە ئێمەت نەوت، ئەویش دەفەرموێ تیشکی چرا زیاد بکەم، یاکەم، هەر عومەری جارانم.

- **٧٥- ترسی ئەبوبەکر لە خودا: دەگێڕنەوە:** ئەبوبەکری سدیق (ر.خ) ئەوەندە دەگریا سەری کولمەی خەتدار بوو بوو، بگرە جارێك باڵندەیەکی لە ئاسمان دیت گوتی: خۆزگە باڵندە دەبووم، رزگارم دەبوو لە دۆزەخ !!

- **٧٦ - ئەبوبەکر لە پێش مەرگدا جێنشینی خۆی دا عومەر: دەگێڕنەوە:** ئەبوبەکری سەدیق لە دەوروبەری سەرە مەرگیدا، ڕووی لە یاران کردو گوتی: ئایا ڕەزامەند نابن کە لە پاش خۆمدا عومەر ببێتە جێنشینتان؟ گوتیان بەڵێ: گوتی: کەواتە لە قسەی دەرنەچن.

- **٧٧- رێزی گەوران پێویستە : دەگێڕنەوە:** جارێك ئەبودەردا لە کاتی رۆیشتنیدا لـە پـێش ئەبوبەکر دەرۆیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئـەی (ئـەبو دەردا) چـۆن پـێش یـەکێك دەکەویت، جگە لە پێغەمبەران کەس لەئەو گەورەتر نی یە .

- **٧٨- گزی هۆی چوونە دۆزەخە : دەگێڕنەوە:** جارێك هاوەڵێکی گـەنج لـە غـەزادا تیرێکـی پێدەکەوێت و شەهید دەبێت، یاران لەناو خۆیـان دەڵـێن لـە خـۆی خـەنی شـەهید بـوو، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: (وا لـە نێـو سـزای گـۆڕە) چـونکە عەبایـەکی بـەگزی (خیانەت) کردووەتە هی خۆی !!!!!!
- **٧٩- پاشمـاوەی پـشیلە پاکـژە:** پێـشەوا مالیـك لـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە پرسیاریان لـێ کرد، ئایا پاشماوەی پشیلە پیسە ؟ پێغەمبەر فەرمووی نەخێر.
- **٨٠- سیواك کردنی بێ ددانان : دەگێڕنەوە** عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەگەر یەکێك ددانی نەمابێت چۆن سیواك بکـات ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی بـە پەنجـە سیواك بکات واتا : پەنجەی لە زاری وەربدات.
- **٨١- دوو نەفرەت لێ کراو : دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ): خۆتان لە دوو نەفرەت لێ کراو دوور بکەنەوە ، یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا دوو نەفرەت لـێ کراوەکـە چین ؟ پێغەمبەر فەرمووی ئەو کەسەی لەسەر رێگە و بەرسێبەر پاشەڕۆ دەکات.
- **٨٢- مشکی ناورۆن : دەگێڕنەوە:** یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ؟ حوکمی ئـەو رۆنـە چی یە کە مشکی کەوتۆتە ناو؟ پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) ئەگەر رۆنەکە توند بوو، ئـەوە تەنها دەورووبەرەکەی فڕەبدەن، ئەگەر شلیش بوو ئەوا هەمووی فڕە بدەن.
- **٨٣- حوکمی ژنی بێ نوێژ : دەگێڕنەوە:** ئیبن مەسعود دەفەرموێ: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد، ئەی پێغەمبەری خودا ! ژنێك لەبێ نوێژیدا بێـت چـیم بـۆ دروسـتە لەگەڵیـدا ؟ پێغەمبـەر فەرمووی: تەنها دروست بوون دروست نی یە.
- **٨٤- حوکمی جولەکە لەگەڵ ژنی بێ نوێژ : دەگێڕنـەوە:** ئەنـەس دەڵـێ: جولەکـە داب و نەریتیان ئاوا بوو، لەگەڵ ژنی بێ نوێژ نانیان نەدەخوارد، لەگەڵیان دانەدەنیشتن . پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمووی کارەکەیان هەڵەیە، هەموو شتێ بکەن جگە لە دروست بوون.

- **٨٥- کەفارەی چوونە لای بێ نوێژ: دەگێڕنـەوە:** پێغەمبـەر فەرموویـەتی: ئەگـەر یـەکێك بچێتە لای ژنی بێ نوێژی خۆی، لـە سەرەتای خوێنەکـەدا کەفارەکـەی میـسقالە زێڕەکـە، ئەگەر لـە کۆتایی خوێنەکەش بوو ئەوا نیو مسقاڵە.
- **٨٦- قەڵەمی خودا لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر فەرموویەتی پێنووسی خودا لـەسەر سێ کـەس هـەڵگیراوە: ١ – نوسـتو تـا لـەخـەو هەڵدەسـتێت. ٢- منـداڵ تـا هەرزەکار دەبێت. ٣- شێت تا چاك دەبێت.
- **٨٧- دەنگ بەرزکردن بۆ بانگ خێرە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر بـە (ئـەبو سـەعیدی خـودری) گوت: بەڕاستی من تۆ دەبینم کە زۆر ئارەزووت لـە دەشتە، جا ئەگەر بـۆ نوێـژ بانگـت دا دەنگت زۆر بەرز بکە، چونکە ئەوەندەی دەنگت بەرز بکەیت، هەرشتێ گوێی لـە دەنگـت بێت لـە دوارۆژداشایەتیت بۆ دەدەن.
- **٨٨- وازهێنان لە خودا پەرستی: دەگێڕنـەوە:** پێغەمبـەر (ﷺ) بـە عەبـدوڵڵای عـەمری عاسی گوت: ئەی عەبدوڵڵا وەك فیسار مەبە، ماوەیـەك نوێـژ دەکـات، دوایـی وازی لـێ دەهێنێت.
- **٨٩- جەستەی ژن هەموو شەرمگەیە جگە لە روخسار و دەست: دەگێڕنەوە:** پێغەمبـەر (ﷺ) بە (ئەسمای کچی ئەبوبەکری سدیقی) گوت: ئـەی (ئـەسماء) ئەگـەر ژن هـەرزەکار بـوو، دروست نی یە، هیچ ئەندامێکی جەستەی دیار بێت جگە لـە ڕوخسار و دەستەکان.
- **٩٠- کـاتـی نوێژی جەژنەکان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر نامەیەکی بۆ (عەمری حەزم) نوسی کـە ئەوکات (عەمر) لـە (نەجران) بوو، ئەی عەمر ؟ نوێـژی جـەژنی ڕەمـەزان درەنـگ بکـە و نوێژی جەژنی قوربان زوو بکە.
- **٩١- ئەبوبەکر ئارەقی بە خەیاڵیدا نەهاتووە: دەگێڕنـەوە:** ئەبوبـەکری سـەدیق نـە لـە سەردەمی نەفامی، نە لـە سەردەمی ئیسلامەتیدا ئارەقی نەخواردۆتەوە، چونکە جارێك بەلای ئارەق خۆرێ تێ پەڕی، ئارەق خۆرەکە لـەبەر سەرخۆشی دەستی لـەنێو پیـسایی نـابوو، بـۆ نێو زاری دەبرد، لـەبەر ئەوە ئارەقی بە خەیاڵـیشیدا نەدەهات.

- **٩٢- ئەیوب پێغەمبەر و گرفتی: دەگێڕنەوە:** کاتی خودای گەورە ئەیوب پێغەمبەری بەهۆی نەمانی منداڵی و سامانی تاقی کردەوە ، جارێك ژنەکەی گوتی: بۆچی داوا لە خودا ناکەیت ئەم گرفتەمان لەسەر لابات و دەرکەی خۆشیمان لێ بکاتەوە ؟ ئەیوب پێغەمبەر فەرمووی: ماوەی چەند ساڵە لە شادی داین ؟ ژنەکە گوتی ماوەی (٦٠) ساڵە ئێ کەواتە چۆن شەرم نەکەم کە شادیەکەمان گەلێك پترە لە گرفتەکەمان.
- **٩٣- خودا بەبەزەیی ترە بۆ بەندەی لە باوك و دایك: دەگێڕنەوە:** جارێ ژنێ منداڵێکی لێ بزر دەبێت، ئەویش بەدوایا دەگەڕێ، تا دەیدۆزێتەوە، ئینجا ماچی دەکا و بۆنی دەکات، پێغەمبەریش چاوی لێ دەبێت و بە هاوەڵەکان دەڵێت، خودا بە سۆزترە بۆ بەندەی لەم دایکە بۆ منداڵەکەی !
- **٩٤- چاکە لەگەڵ گیانداران: دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ لە بیابانێکدا زۆر پەرۆشی ئاو دەبێت و بە دوای ئاودا دەگەڕێت، تا بیرە ئاوێ دەدۆزێتەوە، دەچێتە ناو بیرەکە و تێر ئاو دەخواتەوە، کە دێتە دەرەوە وا سەگێك لە دەوروبەری بیرەکەدا کزو مەلول بووە لەبەر تینوێتی، بەڵام ناتوانی دەمی بباتە ناو بیرەکە، کابرا دڵی نەرم دەبێ و دەچێتە ناو بیرەکە، پێڵاوەکەی پڕ ئاو دەکا و دەیداتە سەگەکە بەهۆی ئەم چاکەیە خودا لێ ی خۆش دەبێت.
- **٩٥- خراپە لەگەڵ گیانداران: دەگێڕنەوە:** ژنێ زۆر چاك بوو، رۆژیگرو زکر کار بوو، بەڵام جارێ لە جاران لەسەر هیچ و بەلاش پشیلەیەکی تۆپاند، خودای گەورە بەهۆی ئەم کارە بردیە دۆزەخ.
- **٩٦- سەردان ناوە ناوە بێ: دەگێڕنەوە:** ئەبو هورەیرە زۆر لەسەر یەك دەچووە سەردانی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ناوە ناوە وەرە . خۆشەویستیەکەمان زۆرتر دەبێت.
- **٩٧- ترسی عوسمان لە گۆڕ: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عوسمان کاتێ باسی گۆڕی لەلا دەکرا، زۆر دڵتەنگ و غەمبار دەبوو، جا پرسیاریان لێ کرد ئەمەت لەبەر چی یە ؟ فەرمووی: پێغەمبەر فەرموویەتی: گۆڕ یەکەم قۆناغە، ئەگەر مەردوم لەگۆڕ دەربچێت، لە قیامەتیش دەردەچێت.

- **٩٨- موسوڵمانی ئـازا : دەگێڕنـەوە** (جـاریێ پێـشەوا عومـەر وتـار دەدات دەڵێـت: ئـەی موسوڵمانینە گوێ بگرن ! سەلمانی فارسی دەڵێـت گـوێ نـاگرین دوێـنێ جلێکـت لـەبـەر دابوو، ئیمڕۆش یەکێکی تـر، پێـشەوا عومـەریش ڕوو لـە عەبـدوڵلای کـوڕی دەکـات و دەڵێت: عەبدوڵلا کورم جلێکیـان هـی تـۆنی یـە ؟ عەبـدوڵلاش دەڵێـت: بـەڵێ، سـەلمان دەڵێت: ئێستا گوێ دەگرین.
- **٩٩- چـاکێتی جەسـتە لـە دڵەوەیـە: دەگێڕنـەوە:** جـاریێ (لوقمـانی حـەکیم) شـوانی دەوڵەمەندێ دەبێ، دەوڵەمەندەکە دەڵێت: لوقمان مەڕێکم بۆ سەربڕە چاکترین گۆشتم بۆ بهێنە، ئەویش مەڕێ سەر دەبڕێت و دڵ و زمانەکە لای دەوڵەمەندەکـە دادەنێـت، دەڵێـت قوربان ئەمە چاترین گۆشتە . ئینجا دووبارە فەرمانی کوشتنەوەی مەڕێکی تری پێ دەکات، بەڵام ئەمجارە دەڵێت: خراپترین گۆشتم بۆ بهێنە لوقمان دووبارە، زمان و دڵەکـەی لـەپێش دادەنێت، کابرا دەڵێت: تێت ناگەم ؟ گـوتم باشـترین گۆشـت زمـان و دڵـت هێنـا، گـوتم خراپترین گۆشت زمان و دڵت هێنا، لوقمان دەڵێت گەورەم گەر ئەمانە چاك بن جەستەش چاك دەبن!
- **١٠٠- لەخەو هەڵسـان وەك زیندووبونەوەیـە: دەگێڕنـەوە:** جـاریێ لوقمـانی حـەکیم بـە کوڕەکەی دەڵێت: مەخەوە لە خەویش هەڵمەستە، کوڕەکە دەڵێت: باوکە ناتوانم، لوقمان دەڵێت: چۆن دەخەوی ئاوها دەمریت، چۆنیش لەخەو هەڵدەستیت ئاوا زیندوو دەبیتەوە!؟
- **١٠١- شوێنی تـاوان: دەگێڕنەوە:** جارێك (داودی تائی) بەلای شوێنێ تێپەڕی لەخۆ چـوو . کە بەخۆی هاتەوە . پرسیاریان لێ کرد بۆچی وات لێ هات ؟ گوتی: لەو شـوێنە جارێـك باسی پیاوێکم هێنا، داواکەیم بە بیر هاتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا لەبەرامبەر خودا.
- **١٠٢- هەموو شتێ لە دەست خودایە : دەگێڕنەوە:** جارێك هارونە ڕەشید پیاوێکی بەند کرد، لە پاشان دەرگەی بەندیخانەکە گوشاد بوو . خەبـەر گەشـتە هارونـە ڕەشـید گـوتی: کـێ بەریدای ؟ کابرا گوتی: ئەوەی گرتمی، هارون گوتی: کێ تۆی گرت .کابرا گوتی: ئـەوەی بەریدام . مەبەستی خودا بوو.
- **١٠٣- بێ بـاوەڕی گەورەتـرین نەخۆشیە : دەگێڕنەوە** . جارێك عیسا پێغەمبەر (ﷺ) بـەلای

پیاوێکی کوێرو بەڵەك و پەککەوتە تێپەڕی دەیگوت: ئەی خودا: زۆر سوپاس کەمنت لە نەخۆشیەك ڕزگار کردووە زۆر کەس گیرۆدەی ئەو نەخۆشیەیە، عیساش گوتی: بۆ هێشتا لەتۆ نەخۆشتر هەیە ؟ کابرا گوتی: بەڵێ پیاوی بێ باوەڕ . عیسا گوتی: ڕاست دەفەرمووی.

- ١٠٤- **سێ تاوان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (لا تدخل الملائکه بیتا فیه صوره ولا کلب ولا جنب- د. ن ــ فریشتەی خودا نایەتە ماڵێك وێنە و سەگ و لەش پیسی تیابێ.
- ١٠٥- **نابیە چاك تا بە گوێی شەرع نەکەی: دەگێڕنەوە** جارێك لای بایەزید باسی پیاوێکیان کرد .کەوا زۆر چاك و خودا ناسە. بایەزیدیش بۆ لای چوو، یەکسەر گەڕایەوە لەبەر ئەوەی کابرا تفی بەرەو ڕووگە ڕووکرد بایەزید گوتی: ئەگەر چاك بوایە ئەدەبی دەبوو بەرامبەر ڕوگەی خودا (قیبلە).
- ١٠٦- **ڕێزی پێغەمبەر لەلای عباس: دەگێڕنەوە:** جارێك بە عەباسی مامی پێغەمبەریان گوت: تۆ گەورەتری یا پێغەمبەر ؟ گوتی: ئەو گەورەترە، بەڵام من لە پێش ئەو لە دایك بوومە!.
- ١٠٧- **فریشتەکان لەسەر پیاو چاکان دەکەنەوە: دەگێڕنەوە:** جارێك زەیدی حاریسە لەگەڵ پیاوێکی مونافیق دەردەچێت لە چۆلیەك مونافیقەکە دەست و پێی زەید دەبەستێ و دەڵێت: دەتکوژم دەنگێك دێت دەڵێ: مەی کوژە لەپاش دەنگەکە دووبارە مونافیقەکە دەیەوێ بیکوژێ دووبارە دەنگێ دێت دەڵێ: مەی کوژە، لە پاش دەنگەکە سێ بارە مونافیقەکە دەیەوێ بیکوژێ. بەڵام یەکێك حەربەیەکی لێ دەدا و مونافیقەکە دەکوژی و دەست و پێی زەید دەکاتەوە و دەڵێت: من جبریلم لە جاری یەکەم لە سیدرە بووم. لە جاری دووهەم لە ئاسمانی دونیا بووم، لە جاری سێهەم گەیشتمە لات.
- ١٠٨- **گیاندار لە قسەی پیاوچاکان دەرناچن: دەگێڕنەوە:** جارێك سەلمانی فارسی میوانی هات، ئەو میوانەکەی لەگەڵ خۆی بردە دەشت، ڕووی لە باڵندە و ئاسك کرد، ئەوانیش هاتن سەلمان سەری بڕین کابرای میوان گوتی: سبحان اللـه ! سەلمان گوتی: ئایا دیوتە

یەکێك خوداناس بێ، خودا لەگەڵی نەبێ!.

- **١٠٩- نزای شەو: دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد چ کاتێ بۆ نزا و پاڕانەوە چاکە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: نیوەی شەو و لەپاش نوێژدا . (ت).
- **١١٠- نوێژ قەدەغەکاری تاوانە: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێك ویستی زینا لەگەڵ مەلاژنێك بکات، مەلاژن گوتی: بەمەرجێ چل نوێژی بەیانی لە پشت پیاوەکەم بکەیت، واتا چل ڕۆژ ـ لەپاش چل ڕۆژەکە مەلاژن باسی داوای کابرای کرد، کابرا گوتی: تۆبەم کردووە!.
- **١١١- دەست نوێژ لابەری تاوانە: دەگێڕنەوە:** جارێك عیسا پێغەمبەر بەلای رووبارێك تێپەڕی باڵندەیەك پێنج جار خۆی لەنێو قوڕ دەنا و دەچووە ناو ئاوەکە، حەزرەتی عیساش. ئەم پرسیارەی لە جوبریل کرد، ئەویش گوتی ئەمە شێوەی ئومەتی پێغەمبەرە، قوڕەکە تاوانە، ئاوەکەش لابەریەتی.
- **١١٢- گەورێتی نوێژی کۆمەڵ لەلای عومەر: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا عومەر نوێژێکی بەکۆمەڵی لە دەست چوو . لە تۆڵەیدا زەویەکی سەد هەزار درهەمباوی کردە خێر !!!
- **١١٣- خێری نوێژی بە کۆمەڵ: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێکی چاك نوێژێکی بە کۆمەڵی لە دەست چوو . ئەویش ٢٥ پێنج نوێژی بە جیا جیای کرد. چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: نوێژی کۆمەڵ خێری یەك بە (٢٥) یا بە (٢٧)ە.
- **١١٤- گەورێتی الله اکبری نوێژ دابەستان: دەگێڕنەوە:** جارێك دز چوار سەد وشتر و بەندەی ئەبوبەکریان دزی . پێغەمبەریش گوتی: ئەی ئەبوبەکر بۆچی خەمباری؟ وام زانی یەکەم (اللە اکبر)ی نوێژ دابەستانت لە دەست چووە. ئەویش گوتی: بۆ ئەوەندە سەختە، ئەگەر (اللە اکبری) یەکەمم لە دەست بچێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، بەڵێ لەگەڵ پڕ بە زەویش.
- **١١٥- سێ نزا لە پاش نوێژی بەیانی: دەگێڕنەوە** . پێغەمبەر کە نوێژی بەیانی دەکرد ئەم سێ نزایەی دەکرد. زانستی بەسوود و کاری گیراو، ڕۆزی ڕەوا.
- **١١٦- مار لە زەکات نەدەر جیا نابێ: دەگێڕنەوە:** لە سەردەمی عەبدوڵڵای عەباس پیاوێك مرد، هەفت گۆڕیان بۆ هەڵ کەند مارێکی تیادابوو، عەبدوڵڵا گوتی: ئەم پیاوە لە دونیا چی

دەکرد ؟ گوتیان: زەکاتی نەدەدا!.

- **١١٧- هاوکاری: دەگێڕنەوە:** جارێك پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هەندێ هاوەڵ لە گەشت دەبن، یەکێك دەڵێ من کاوڕەکە سەر دەبڕم. یەکێکی تر دەڵێ من کەوری دەکەم. یەکێکی تر دەڵێ من دەیکوڵێنم پێغەمبەریش دەڵێ من دارتان بۆ خڕ دەکەمەوە.
- **١١٨- ئەموستیلەی کوڕی خەلیفەی ئیسلام: دەگێڕنەوە:** جارێك کوڕێکی عومەری عەبدولعەزیز، ئەموستیلەیەکی بە هەزار درهەم کڕی، باوکی گوتی: کوڕم ئەموستیلەکەت بفرۆشە هەزار هەژاری پێ تێر بکە، ئەموستیلەیەکی تر بکڕە بە دوو درهەم لە سەری بنوسە (بەخشندەی خودا لەو کەسەی، دەروونی خۆی دەناسی).
- **١١٩- نوێژی تاك: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نوێژی تاك (وتر) لەسەر هەموو موسوڵمانێکە، جا پێنج ڕەکات دەکات، یا سێ، یا یەك ڕەکات، بە حەزی خۆی .(د.ت).
- **١٢٠- ١٠ ڕۆژی پیرۆز:** لە کاتی (١٠) ڕۆژە پیرۆزەکە ڕێبوارێ لە نێو گۆڕستان دەبێ، لەنێو گۆڕێك ڕوناکی دەردەچێت، ئەویش بیر دەکاتەوە دەنگێك دێت دەڵێت: ئەگەر دەتەوێت گۆڕەکەت ئاوا ڕوناك بێتەوە وەك ئەو کابرایە لەم دە ڕۆژە بە ڕۆژووبە.
- **١٢١- گەورێتی ڕۆژی عەرەفە: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێکی چاك دۆستێکی خۆی لەخەو دیت، (١٠) روناکی لەپێش بوو، بەڵام ئەو دوو ڕووناکی لە پێش بوو، پرسیاری کرد: بۆچی من دوو ڕووناکیم هەیە دۆستەکەم (١٠) ڕۆناکی هەیە ؟ گوتیان: ئەو ١٠ ساڵە لە ڕۆژی عەرەفە بە ڕۆژووە. تۆ دووساڵە بەڕۆژی.
- **١٢٢- گەورێتی عاشورا: دەگێڕنەوە:** نەسەفی دەڵێ: پیاوێکی دیل لە ڕۆژی عاشورا لە دەست کافران هەڵات گوتی: خودایە بۆ خاتری ئەم ڕۆژە ڕزگارم بکەی دەڵێت: خوا چاوی کافرەکانی کوێر کرد، کەشەو داهات فریشتەی خودا نان و ئاوی پێدا، ئەم پیاوە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ هەتا مرد نان و ئاوی نەخوارد.!
- **١٢٣- ڕقی شەیتان لە ئێمە: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هەموو ڕۆژێ هەزار جار نەفرەتی لە شەیتان دەکرد، ڕۆژێك لەبەر سێبەری دیوارێ پاڵی دابوو،یەکێك هات گوتی: هەستە ئەم دیوارە بەسەرتا دەکەوێت . قسەکەی تەواو نەکرد . دیوارەکە ڕما. ئەویش گوتی: تۆ کێ

ی ؟ گوتی: شەیتانم، گوتی: بۆ پێت ناخۆشە بمرم ؟ گوتی مەبەستم ئەوە بوو شەهید نەبی.

- ١٢٤- **گەورێتی خۆڵی جەنگ: دەگێڕنەوە:** جەنگاوەرێکی ئیسلام هەموو جارێ کە لە جەنگ دەهاتەوە، جلە بە تۆز و خۆڵەکەی دا دەوەشاند. تا ئەندازەی خۆڵەکە بووە خشتێکی بچوك گوتی: کە مردم ئەم خشتە لە ژێر سەرم دابنێن. لە پاش ماوەیەك لە خەویان دی گوتی: بە بەرەکەتی ئەم خشتە، خودا لێم خۆشبوو.
- ١٢٥- **ئەوەی بە زیندوو دەکرێ بە مردوو ناکرێ: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێك بەلای گۆڕستان تێپەڕی دوو ڕکات نوێژی کرد و پاڵی دایەوە، یەکێك لە گۆڕەکان هاتە ئاخافتن و گوتی: تۆ دەتوانی زۆر نوێژان بکەی، بەڵام وەك ئێمە لە خێرەکەی ناگەیت، ئێمە لە خێرەکەی دەگەین، بەڵام ناتوانین بیکەین.
- ١٢٦- **گەورەترین نوێژ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرمووی (افضل الصلاة بعد الفريضة صلاة الليل- گەورەترین نوێژ لە پاش فەرزەکان شەو نوێژە. (م).
- ١٢٧- **جنێودان بە دایك: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێك بەلای گۆڕێکی شەق بوو تێپەڕی، پیاوێکی لێ هاتەدەر سەری سەری کەربوو، سێ جار زەڕی، پرسیاری کرد، گوتیان: ئەم پیاوە هەموو ڕۆژێك وادەکات، ئەوە ئارەق خۆر بوو، دایکی دەیگوت ئارەق مەخۆ دەیگوت بزەڕە!!!
- ١٢٨- **پەیوەندی کوڕ و باوك بەیەکەوە: دەگێڕنەوە:** لە سەردەمی سولەیمان پێغەمبەر، کوڕێك ئارەقی دەخوارد . باوکەکە خۆی لێ تووڕە کرد . ئەویش چاوی باوکی دەرهێنا، کە بە خۆی هاتەوە، دەستی قوت کرد لە داخان، لە پاشاندا هەردووکیان چوونە لای سولەیمان پێغەمبەر، ئەویش دوعای بۆ کردن و گوتی: خودایە لەبەر رەحمی ئەو باوکە بۆ منداڵەکەی کە دەڵێ ئەگەر هەزار چاوم هەبوایە، کوڕەکەم هەمووی دەرهێنابوایە، نەك دەستی ببڕابوایە، هەروەها لەبەر ڕێزی ئەم منداڵە بۆ باوکی چاکیان بکەیتەوە. یەکسەر چاك بوونەوە.
- ١٢٩- **خێر تەمەن درێژ دەکات: دەگێڕنەوە:** دوو پیاو لەلای داود پێغەمبەر دانیشتبوون، عزرائیلیش لەوێ بوو، عزرائیل گوتی: ئەم پیاوە تەمەنی هەفت ڕۆژ ماوە، لە پاش هەفت

ڕۆژەکە پیاوەکە نەمرد و داود پێغەمبەر گوتی: سەردانی خزمێکی کرد خـوا تەمـەنی (١٠) ساڵ زیاتر کرد.

- ١٣٠- **بەخشندەیی عەلی: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا عەلی سـێ جـار بـانگی بەندەیـەکی کرد وەڵامی نەدایەوە، چوو لێی بدات، بەندەکە پێ دەکـەنی عـەلی گـوتی: بـۆ وەڵامـت نەدامەوە گوتی: ترسم لێت نەبوو.
- ١٣١- **خێر خێری لەدوایە: دەگێڕنەوە:** کابرایـەك و ژنێکـی چـاك هـەبوون، یـەك مـەڕیان هەبوو، ڕۆژی جەژنی قوربان پیاوەکەی ویستی سەری ببڕی، ژنەکەی نەی هێـشت لـەپاش چەند ڕۆژێك میوانیان هات ژنەکە گوتی: بۆ ئەم میوانە سەری بـبڕی باشـە، سـەریان بـڕی پاشان مەڕێك هاتە حەوشەیان وایانزانی مەڕەکەی خۆیتیان، کەچی لە گوانێکی شیر دەهات لەوی تر هەنگوین.
- ١٣٢- **پاداشتی سڵاو قەسرە: دەگێڕنەوە:** هـەموو جارێـك کـە ئەبوبـەکر و عـەلی بەیـەك دەگەیشتن، عەلی سڵاوی لـە ئەبوبەکر دەکرد، جارێك سڵاوی لێ نـەکرد، ئەبوبـەکر ئـەم قسەی بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیاند، پێغەمبەر فەرمووی: بۆ سڵاوت لێ نەکردووە ؟ عـەلی گوتی: لەخەوما قەسرێکم دیت. گوتم ئەم قەسرە بۆ کێ یە ؟ گوتیان بۆ یەکێکە کـە سـڵاو بکات . پێم خۆشە قەسرەکە بۆ ئەبوبەکر بێ نەك بۆ من.
- ١٣٣- **دوو خێری سانا: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویـەتی: کەسـێك دەسـتنوێژێك بـشوا و دوو ڕکات نوێژی لـە دوادا بکات بە دڵێکی بێ خەیاڵ جگە لـە بەهەشت پاداشتەکەی چیتر نییە.
- ١٣٤- **پاشە کەفت: دەگێڕنەوە:** جارێك سولـەیمان پێغەمبـەر مێروولـەیـەکی لـەنێو شووشـە کرد و گوتی: ساڵانە خۆراکت چەندە ؟ گوتی: دەنکـە گـەنمێك کـە سـاڵ سـوڕایەوە نیـو دەنکی خواردبوو، سولـەیمان گوتی: ئەی بۆوتت ساڵانە دەنکێك دەخۆم وتی: بـەڵێ، بـەڵام وتم ئەگەر بەرم نەدەی دەمرم، لەبەر هەندێ ئاوام گوت: ترسام بمرم پاشە کەفت باشە.
- ١٣٥- **خودا ڕۆزی دەرە: دەگێڕنەوە:** جارێك سلێمان پێغەمبـەر بـۆ خـواردن بوونـەوەرەکانی خودای کۆکردەوە، حوتێ هات هەمووی خوارد، سلێمان (ﷺ) گـوتی: هـەموو ڕۆژێـك

ئەوە خواردنتە گوتی: بەڵێ پێریش.

- **١٣٦- چاکترین خێری پێغەمبەر: دەگێڕنەوە** جارێك پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بازێر چوو، هەشت درهەمی لابوو، کەنیزەیەکی دیت دەیگوت: لە ماڵەوە دوو درهەمیان پێداوم شت بکڕم لێم بزر بووە، پێغەمبەر دوو درهەمی پێدا، ئەمجارە پیاوێکی رووتی دیت دەیگوت، ئەوەی بەرگم بکات خودا بەرگی بکات، پێغەمبەر کراسێکی پێدا بەچوار درهەمی کڕیبوو، ئەمجارە سێ بارە بۆ بازێر چوو سێ بارە کراسێکی بۆ خۆی بە دوو درهەم کڕی هەر لە ڕێگەدا کەنیزەیەکی دیت دەگریا گوتی: بۆ دەگریت ؟ گوتی: لەمێژە لەماڵ هاتوومەتە دەر، ناوێرم بچمەوە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵی چوو سێ جار سڵاوی کرد، ماڵەکە سڵاویان لێ وەرنەگرتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆ سڵاو وەرناگرنەوە؟ گوتیان: هیچ رووی نەداوە، لەبەر بەرەکەتی پیرۆزی تۆ وەڵامان نەدایەوە، لەبەر رێزی پێغەمبەر، ئەوانیش کەنیزەکەیان ئازاد کرد.
- **١٣٧- خێر دوور کەرەوەیە لە دۆزەخ: دەگێڕنەوە:** جارێك عائیشە جاریەکی کڕی جبریل هاتە لای پێغەمبەر فەرمووی: ئەم جاریە ئازاد بکەن، چونکە دۆزەخیە عائیشە دەنکە قەسپێکی پێدا، لە پاشاندا جاریەکە تووشی هەژارێك بوو کەرتێکی پێدا، جبریل هاتەوە لای پێغەمبەر گوتی: ئەم جاریە بە کەرتە قەسپێك ڕزگاری بوو لە دۆزەخ.
- **١٣٨-گرژینەوە لەکاتی ناخۆشی: دەگێڕنەوە:** عەبدوڵڵای عومەر لەکاتی ناشتنی ڕۆڵەکەی دەگرژیەوە، بزە خەنەی دەکرد، گوتیان بۆ وادەکەی؟ گوتی: لەرکی شەیتان.
- **١٣٩- ئەندازەی خێری دیاری نەکراو: دەگێڕنەوە:** موتەوەکیل تووشی نەخۆشیەك بوو، گوتی: ئەگەر چاك بوومەوە خێر دەکەم، کە چاك بوو لە نەخۆشیەکە، بۆ لای زانا محەمەد موسا چوو، گوتی: لە خێرەکە چیت لە دڵدا بوو گوتی:تەنها خێر، گوتی: مادام (٨٠) دینار، یادرهەم بکە خێر، چونکە خودا فەرموویەتی: (ولقد نصركم الله في مواطن كثيرة) واتا: ئەی محەمەد . لە زۆر شوێن تۆمان سەرخستووە شوێنەکانم ژماردووە نزیکەی (٨٠) شوێنە.
- **١٤٠- هەژاری یا بازرگان: دەگێڕنەوە:** نەسەفی دەڵێت: پێشەوا عوسمان وشوە ترێیەکی بۆ

پێغەمبەر هێنا، هەژارێك گوتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم وشوەم بدێ پێغەمبەر پێیدا. پێشەوا عوسمان لێی کڕیەوە تا سێ جار، ئینجا پێغەمبەر بە هەژارەکەی گوت: تۆ بازرگانی یا هەژاری؟ لەسەر ئەوەش هێشتا دڵی نەشکاند!.

- ١٤١- **خێر ڕزگارییە: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هاتە لای ئەبوهورەیرە گوتی: کوڕەکەم لەنێو کەشتیە، لافاو هەڵساوە نزامان بۆ بکە گوتی: خێری بۆ بکە، کوڕەکە کاتێ هاتەوە گوتی: باوکە دەنگێ هات گوتی: مەترسن خودا خێرەکەی لێ گیرا کردوون. ڕزگارن.
- ١٤٢-**هەجەل لەکوێ بی لەوێ دەمری: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هاتە لای سلێمان پێغەمبەر گوتی: فەرمان بە با بکە بم باتە هند، عزرائیلیش پێدەکەنی سلێمان گوتی: بۆ پێدەکەنی گوتی: خودا فەرمانی پێ کردووم لە پاش کەمێکی تر گیانی لە هند بکێشم.
- ١٤٣- سێ کاری چاك: دەگێڕنەوە: جارێك پێغەمبەر مێوانی هات، چوو دەست نوێژی شۆرد، مێوانەکان ئاوی دەست نوێژی پێغەمبەریان (ﷺ) بەخۆدا دەکرد بە نیازی تفەڕك پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: بۆ وادەکەن گوتیان خودا و پێغەمبەرمان خۆش دەوێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم سێ شتە بکەن: ١ – ڕاست گۆ بن ٢–ئەمانەت مەخۆن ٣ – لەگەڵ هاوسێ چاك بن.
- ١٤٤- جۆتیار و سولەیمان پێغەمبەر: دەگێڕنەوە: جارێك سولەیمان پێغەمبەر، بەلای جۆتیارێك تێپەڕی، جۆتیارەکە لەبەر خۆی گوتی: خۆزگە سێ قسەم لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەر دەکرد، (با) ئەم قسەیەی بردە ناو گوێی سولەیمان و سولەیمان گوتی: قسەکان چین؟ جوتیار گوتی: خۆشی دوێنێت و ناخۆشی دوێنێم تامیان نەما، هەردووکمان دەمرین. هەردووکیشمان بە ئەندازەی سامان لێ پرسینەوەمان لەسەر دەکرێت، سولەیمان گوتی: ئەگەر خودا لە بەخششی خۆی پەشیمان بوایەوە، ماڵم نەدەویست!.
- ١٤٥- خۆشی و ناخۆشی: دەگێڕنەوە: دوو فریشتەی خودا لە ئاسمانی چوارەم بەیەك گەیشتن، یەکێکیان بەوی تری گوت: بۆ کێ دەچیت گوتی: بۆلای پیاوێك دەچم هەر چاکەیەکی کردبێ خودا پاداشتی داوەتەوە لە دونیا، ئێستا ئەو پیاوە یەك چاکەی هەیە، زۆریشی حەز لە ماسییە ماسیشی چنگ ناکەوێ، بەڵام ماسی بۆ نێو ڕوبارەکەیان دەبەم تا

ئەو چاکەیشی نەمێنێ بۆ قیامەت: ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت ؟ گوتی پیاوێ خراپەی کردبێ خودا تۆڵەی لێ سەندووە، تا لە دوا ڕۆژ ئازاری نەدات، ئێستا هەندێ ڕۆنی زەیتی هەیە وا دەچم لێی دەڕێژم، هەتا دڵ تەنگ بێ لەدوا ڕۆژ پلەی بەرز بێ.

- ١٤٦- ئامۆژگاری سەر ئەموستیلە: دەگێڕنەوە: شێخ حسن بەصری ئەموستیلەیەکی هەبوو، نەیدەزانی چی لەسەر بنووسێ عیسا پێغەمبەری هاتە خەون و گوتی: بنوسە (لاالە الا اللە الملك الحق المبين) چونکە خەم و پەژارە لادەبات.
- ١٤٧- ژیانی پێغەمبەر: دەگێڕنەوە: حەفصەی کچی عومەر بە باوکی گوت: بۆ بەرگی چاك لەبەر ناکەیت گوتی: باشە پێغەمبەر(ص) جاری وابووە ساڵێ تێری نەخواردوو، بەیانی تێر، ئێوارە برسی، یا بە پێچەوانەوە، یا جلی تەڕبوو، بیلال بانگی دەدا جلی نەبوو لەبەری بکا، جگە لە جلی خێزانەکانی .... هەر قسەیەکی بۆ دەکرد هەمووی بە سوێند، حەفصەش هەر دەیگوت وایە.
- ١٤٨- ڕۆزیی خودا: دەگێڕنەوە: زەنونی مصری دەڵێت: جارێك بەدوای ڕۆزی دەگەڕام، باڵندەیەکی کوێرم دیت دەنوکی لە زەوی دەدا دان و ئاو دەهاتنە دەر کەتێری خوارد دان و ئاوەکە چونەوە ژێر خاك.
- ١٤٩- **خودا ڕۆزیی بە کەسێك بدات باڵندەی بۆ مسەخەر دەکا: دەگێڕنەوە**: مالیکی دینار دەڵێت: باڵندەیەکم دیت کولێرەیەکی بە دەنووکەوە بوو، بە دوای کەوتم سەیرم کرد پارو پارو لەدەمی پیاوێکی پیر دەنێت، پاشان ئاویشی پێدا، گوتم: خاڵە تۆ بۆچی بەسترایەوە گوتی: من لە ڕێی حەج هاتمەوە دز قۆڵ و پێیان بەستم منیش هاوارم کرد: خودایە فریام کەوە شڵەژاوم، ئەوە ماوەی پێنج ڕۆژە لێرەم.
- ١٥٠- **نابێ لە فەرمانی مێردی دەربچێ: دەگێڕنەوە**: جارێك ژنێك بەبێ پرسی پیاوەکەی لەماڵ دەردەچوو، پیاوەکەش تەڵاقیدا گوتیان بۆ تەڵاقتدا گوتی: پێغەمبەر(ص) فەرموویەتی هەر ژنێ بەبێ پرسی پیاوەکەی لەماڵ دەرچێ فریشتە نەفرەتی لێ دەکات، بۆچی بەبەر ئەم نەفرەتە بکەوم و بکەوێت!
- ١٥١- **نێربازی: دەگێڕنەوە**: جارێك عیسا پێغەمبەر (ﷺ) لەشوێنێ ئاگرێکی دیت پیاوێکی

دەسوتاند، ویستی بەئاو بیکوژێنێتەوە ئاگرەکە بوو بەمێرد منداڵێك، ئەویش لەبارەگای خودا دەپاڕایەوە کە ئەوە هۆی چیە؟ پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من نێربازیم لەگەڵ ئەو منداڵە دەکرد.

- ١٥٢- **سەگ ڕاگرتن بۆ پاسەوانی دروستە: دەگێڕنەوە:** نوح پێغەمبەر کاتێ کەشتی دروست دەکرد، گەلە مل هوڕەکەی بەشەو لێیان تێك دەدا، ئەویش لەبەر خودا پاڕایەوە، خودا فەرمووی سەگ ڕابگرە بۆ پاسەوانی . زانایان دەڵێن نوح پێغەمبەر یەکەم کەس بوو، کە سەگی بۆ پاسەوانی ڕاگرتبێ.
- ١٥٣- **جوانی تەقوا: دەگێڕنەوە:** یەکێك لە پیاوە چاکەکان دەڵێت: لەخەودا گەنجێکی جوانم دی، گوتم تۆ کێ ی ؟. گوتی: من تەقوام، گوتم: جێت لە کێ یە ؟ گوتی: لەنێو دڵێکی بە خەم و چاوێکی بە فرمێسك، ژنێکی ناشرینم لەخەو دیت گوتم تۆ کێیت جێت لە کوێ یە گوتی: دڵێکی بێ ئاگا و زارێکی بە پێکەنین.
- ١٥٤- **شەیتان و پیاو خراپان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە شەیتان کرد: تۆ لەگەڵ کێ دەخەوی؟ گوتی: مەی خۆر، لەگەڵ کێ هاونشینی؟ گوتی: ئەوەی نوێژ دوا دەخا، کێ میوانتە، گوتی: دز، کێ هۆگرتە؟ گوتی: شاعیری خراپ، کێ گلێنەی چاوتە، گوتی: ئەوەی سوێند بە تەلاق دەخوات، کێ خۆشەویستتە؟ گوتی: نوێژ نەکەر، کێ بەڕێزترین کەسە لەلای تۆ؟ گوتی: ئەوەی جنێو بە ئەبوبەکر و عومەر دەدات.
- ١٥٥- **ئەبو حەنیفە و جولەکە: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا حەنیفە چوو قەرزی وەربگرێتەوە لە جولەکەیەك، لە پێش دەرگەی جولەکەکە پێی ڕادەوەشاند، تۆپە قوڕێك بە دیوارەکەوە لکا، لە خەیاڵی خۆیدا گوتی:ئەگەر لێی بکەمەوە دیوارەکە ناشیرین دەبێ، ئەگەر لێی نەکەمەوە نابێ، ناوەڵا پێی دەڵێم، جولەکەکە هات گوتی: جارێ قەرزم لێ مەسێنە، پێشەوا حەنەفی گوتی: تۆ مەسرەتی ئەم دیوارەم لەگەڵ بکە، جولەکەکە گوتی: قوربان (اشهد ان لا الە الا اللە و اشهد ان محمدا رسول اللە) خۆم پیسم، نەك دیوار .....
- ١٥٦- **بەخشندەیی موسا (ﷺ): دەگێڕنەوە:** خودای گەورە فەرمووی، ئەی موسا: دەزانی بۆچی تۆم کردە کەلیم ؟ لەبەر ئەوەی تۆ جارێك لەبەر مەڕ بووی، مەڕێك هەڵات

چەند کەند و دۆڵت لەدوا کرد، پاشان لێت نەدا بەزەییت پێ هاتەوە.

- ١٥٧- **سید ئەحمەدی رفاعی: دەگێڕنەوە:** جارێك شێخ ئەحمەدی رفاعی پاڵی دابۆوە لە رۆژی هەینی، پشیلەیەك لەسەر هەنگوچکەکەی خەوتبوو، ئەویش دڵی نەهات هەڵی بستێنێ یەکسەر هەنگوچکەکەی قوت کرد، لەپاش نوێژی هەینی، پشیلەکە نەمابوو، هەنگوچکەکەی دووریەوە.
- ١٥٨- **پیری ئاخر خێر: دەگێڕنەوە:** جارێك سلێمان پێغەمبەر بە پیرێکی گوت: پێت خۆش نیە بمریت گوتی: نەخێر، چونکە گەنجیم لە خراپە خەرج کرد، پیریش بە چاکە تا ئێستا.
- ١٥٩- **بەشەکانی هۆش: دەگێڕنەوە:** قەتادە دەڵێت: سێ پیاو هەیە یەکێکیان پیاوە واتا عاقڵە، دووهەمیان نیوە پیاوە واتا عاقڵ نیە بەڵام پرسیان پێ دەکات، سێهەم هیچ نییە واتا نە عاقلە نە پرس بە عاقڵان دەکات.

- ١٦٠- **مردنی ئەمانە: دەگێڕنەوە:** لقمانی حەکیم لە گەشت هاتەوە بە بەندەکەی گوت، باوکم لەکوێیە، گوتی: مرد، گوتی: ئەی دایکم، گوتی: مرد گوتی: خەمم نەما گوتی ئەی خێزانەکەم؟ گوتی: مرد گوتی: خەوگام نوێ بۆوە، گوتی ئەی خوشکەکەم؟ گوتی: مرد گوتی عەیب و عارم داپۆشرا، گوتی: ئەی برام؟ گوتی: مرد گوتی پشتم شکا.
- ١٦١- **گەورێتی هۆش: دەگێڕنەوە:** کاتێ ئادەم پێغەمبەر هاتە سەر زەوی جبریل هاتە لای و گوتی: خودا ئازادی کردی لە (ئایین و پیاوەتی و عەقڵ) کامەیان هەڵدەبژێری؟ ئادەم گوتی: عەقڵ، جبریل بە ئایین و پیاوەتی گوت برۆنەوە ئاسمان، گوتیان بە فەرمانی خوا ئێمە نابێ لە عەقڵ جیا ببینەوە!!
- ١٦٢- **گەورەترین شت: دەگێڕنەوە** فریشتەی خودا گوتیان: خودایە چ شتێکت دروست کردووە لە عەرشی خۆت گەورەتر ؟ خودا فەرمووی: عەقڵ گوتیان: ئەندازەی گەورەییەکەی چەندە ؟ خودا فەرمووی: ئایا دەزانن ژمارەی قوم (رمل) چەندە گوتیان نەخێر، گۆتی عەقڵم دابەش کردووە بە هەمەڕەنگی، پیاو هەیە دەنکێك، دوو دەنك، سێ دەنك، چوار دەنك.

- **١٦٣- سەردانی زانا: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویەتی خودا شارێکی هەیە لە ژێر تەختی خۆی، ئەم شارە لە میسك دروست کراوە، لە دەرگەی شارەکە فریشتە یەك ڕاوەستاوە هەموو ڕۆژێك دەڵێت: هەر کەسێك سەردانی زانایەك بکات، سەردانی خودای کردووە! کە سەردانی خودای کردبێ، دەچێتە بەهەشت.
- **١٦٤- جوانی ئاسمان و زەوی: دەگێڕنەوە:** جوانی ئاسمان بەسێ شتە ڕۆژ – مانگ – ئەستێرە، جوانی زەویش بەسێ شتە: زانا– باران– سەرۆکی چاك.
- **١٦٥- باوەڕ نوێ کردنەوە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی باوەڕتان نوێ بکەنەوە، یاران گوتیان: باوەڕ چۆن نوێ دەبێتەوە ؟ پێغەمبەر فەرمووی(لاالـه الا الـلـه) زۆر بکەن. (الحاکم).
- **١٦٦- سێ وەسیەت: دەگێڕنەوە:** ئەبو دەرداء گوتی: پێغەمبەر سێ وەسیەتی کردم:

١- هاوبەشی بۆ خودا دانەنێم، هەر چەند ببڕێم و بسووتێم.

٢- نوێژ نەچوێنم، چونکە کەسێك نوێژ بچوێنێ لە ئایین دەردەچێ.

٣- ئارەق نەخۆم، چونکە سەرچاوەی هەموو تاوانێکە، (ابن ماجەو البیهقی).

- **١٦٧- سامان و زانست: دەگێڕنەوە:** خودا حەزرەتی سلێمانی ئازاد کرد لە سامان و زانست کامە یانت دەوێ؟ گوتی: زانست، بۆیە خودا هەردووکی پێ بەخشی.
- **١٦٨- نوێژی بێ دەست نوێژ: دەگێڕنەوە:** فریشتە ١٠٠ جەڵدەیان لە مردووێك دا تا کردیانە خاك و خۆڵ گوتی: لەبەرچی لێم دەدەن؟ گوتیان نوێژێکت بێ دەست نوێژ کردووە و بەلای بێ دەسەڵاتێ داچووی لەسەرت نەکردۆتەوە.
- **١٦٩- زکری پاش دەست نوێژ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویەتی کەسێك دەست نوێژ بشوا لەپاش دەست نوێژەکەی بڵێ (اشهد ان لا الـه الا الـلـه وحده لاشریك له واشهد ان محمـدا عبده و ورسوله اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المتطهـرین) هەر هەشت دەرگەی بەهەشتی لێ دەکرێتەوە، لە کامەیان بخوازێ دەچێتە ناوی.
- **١٧٠- چوونە لای نەخۆش: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویەتی: خودا لە ڕۆژی دوایی دەڵێتە مرۆڤ بۆچی کاتێ نەخۆش کەوتم نەهاتیە سەردانم، بەندەش دەڵێ ئەی خودایە تۆ چۆن

نەخۆش دەکەویت تۆ پەروەردگاری ؟ خودا پێی دەڵێ ئەگەر سەردانت بکردبوایە من لەوێ بووم، واتا پاداشم لەوێ بوو.

- **١٧١- شەقیقی بەڵخی و هاروون: دەگێڕنەوە:** جارێك شەقیقی بەڵخی چووە لای هارون رەشید گوتی: ئامۆژگاریم بکە گوتی: خودا تۆی لەجێی ئەبوبەکر داناوە جا ڕاستگۆبە، تۆی لە جێی عومەر داناوە هەق خواز بە، تۆی لە جێی عوسمان داناوە شەرمن بە، تۆی لە جێی عەلی داناوە دادوەر و زانا بە، ماڵ و قامچی و شیری پێداوی ماڵ بدە هەژار و ئامۆژگاری خەڵك بکە بە قامچی هەق وەربگرەوە بە شمشێر، چونکە خودا دوو ماڵی هەیە، تۆ دەرگەوانی دۆزەخی هاروون گوتی: هێشتا ئامۆژگاریم بکە گوتی: تۆ دەریای ئەوان ڕووبار، تۆ تاکو شێلو نەبی ئەوان شێلو نابن.
- **١٧٢- پێشەوا عەلی و جولەکەیەك: دەگێڕنەوە:** جولەکەیەك بە پێشەوا عەلی گوت: خودا لە کوێیە ؟ پێشەوا عەلی فەرمووی: خودا پرسیاری کوێی لێ ناکرێت، چونکە خۆی کوێی دروست کردووە گوتی: خودا چۆنە ؟ پێشەوا عەلی گوتی: خۆی چۆنی دروست کردووە، چۆن بە چۆن پرسیاری لێ دەکرێت. گوتی: لە کەیەوە هەبووە، پێشەوا عەلی گوتی: هاوار لەخۆت لە کەیەوە نەبووە.
- **١٧٣- تاوان نەخۆشیە: دەگێڕنەوە:** جارێ عیسا پێغەمبەر (ﷺ) یەکێ لە هاوەڵەکانی دیت لەماڵی ژنێکی خراپ دەهاتە دەر، عیسا پێغەمبەر گوتی: برا ! بۆ لەو ماڵە هاتیەدەر گوتی: پزیشك چارەی نەخۆش دەکات!!
- **١٧٤- زیانەکانی بت: دەگێڕنەوە:** جارێ ژنێ هاتە لای ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: دەمەوێ بت لە باوکت بکڕم ؟ ئیبراهیم (ﷺ) گوتی: بە بتەکە ئاو بینە و شیو لێ بنێ و نان دروست بکە، ژنەکەش بتەکەی بە خودا دەزانی گوتی: ئەی چی بپەرستم: بلێ: لاالە الا اللە!!
- **١٧٥- وازهێنانی ئەبو زەڕ لە بت: دەگێڕنەوە:** ئەبو زەڕی غەفاری لەسەرەتا بت پەرست بوو، جارێ بۆ کاری پێویست دەرچوو، کە هاتەوە سەیری بتەکەی کرد تەڕبووە گوتی: باشە باران نەباریوە، سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و گوتی خودایە بە ڕاستی تۆ خودای،

ئەگەر ئەم بتە خودا بوایە، چۆن ڕێوی میزی پێدا دەکردا!؟

- ١٧٦- **قازی خودا ناس: دەگێڕنەوە** جارێ ڕووداوێکیان بردە لای قازیەك، قازی کە سەیری پەراوەکەی کرد گوتی: حوکمتان بۆ نادەم، خاوەن هەق گوتی: لەبەر چی ؟ گوتی: چۆن (بسم اللـه الرحمن الرحيم-تان لەسەر وەرەقەکە نەنوسیوە !!
- ١٧٧- **نیاز پاکی- دەگێڕنەوە:** یەکێك لە بەندە چاکەکانی نەوەی ئیسرائیل، ڕۆژێ بەلای قومێك (لم) تێدەپەڕێ، لەدڵی خۆیدا دەڵێ: بە خودا ئەگەر ئەوە ئارد بوایە، ئێستا هەمووم دەکردە خێر. خودای گەورە پەیام بۆ پێغەمبەری ئەو کات ڕەوان دەکات، دەڵێت: سلاو لە فیسار بکە بەڕاستی خێرەکەم بۆ نوسیوە.
- ١٧٨- **پێشەوا عەلی و عەرەبێ: دەگێڕنەوە:** جارێ عەرەبێ بە پەلە نوێژ دەکات، پێشەوا عەلیش چاوی لێ دەبێت پێی دەڵێت: نوێژێکی تر لەسەر خۆ بکە، ئەویش بە گوێی دەکات، ئینجا پێشەوا عەلی دەڵێت: کامەیان چاکتر بوو ؟ کابرا دەڵێت: هی یەکەم، پێشەوا عەلی دەڵێت: لەبەر چی کابرا دەڵێت: هی یەکەمم بە حەزی خۆم بوو، بەڵام هی دووەم لە ترسی قەمچی یەکەی تۆ بوو!!!.
- ١٧٩- **گەورەیی نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران: دەگێڕنەوە:** لەزانایانی مەزهەبی پێشەوا شافیعی، ڕەحمەتی خودایان لێ دەفەرموون: نوێژی ڕۆژ گیران و مانگ گیران خێری پترە لە نوێژە بارانە، چونکە نوێژە بارانە بۆ ئازووقەیە، بەڵام ئەوان تایبەتن بە خودا و سوودی بونەوەر.
- ١٨٠- **نیاز پیسی: دەگێڕنەوە:** عەبدوڵڵای عەباس دەڵێت: یەکێك لە پاشایان دەگەڕێت لە وڵاتەکەی خۆی لە شوێنێ، پیاوێك دەبینێ وا چێڵێك دەدۆشێ شیری سی چێڵ دەدا، پاشاش لە خەیاڵی خۆیدا نیازی بردنی چێڵەکەی دەبێت، بەیانی دەچێتە لای خاوەن چێڵ بەڵام ئەمجارە شیری زۆر کەم دەبێ، پاشا دەڵێت: برا چێڵەکەی دوێنێ نیە ؟ کابرا دەڵێت: بەڵێ، پاشا دەڵێت ئەی بۆ ئاوای لێ هات ؟ کابرا دەڵێت گومان هەیە، پاشا نیازی پیس بوو بێ!.
- ١٨١- **شەقیقی بەلخی و ئیبراهیم ادهم** : دەگێرنەوە شەقیق بۆ بازرگانی

دەرچوو،ئیبراهیمی لـەجێی خـۆی دانـا، لەرێگـە چـاوی بـە باڵندەیـەکی کـوێر کـەوت‌و باڵندەیەکی ساغ خواردنی پێدەدا گوتی: بازرگانی ناکەم ئیبراهیم گوتی: بۆ؟ گـوتی لـەبـەر ئەوباڵندە کوێرەکە باڵندە ساغەکە رۆزی پێدەدا، ئیبراهیم گوتی: ئەی پێغەمبەر نەیفـەرمووە ئەوەی دەبەخشی لەئەوەی وەردەگری چاکترە بۆنابیە بالندە ساغەکە شقیق بەگوێی کردوم دەستی ماچ کرد..

- **١٨٢- گەورەیی بسم الله الرحمن الـرحیم: دەگێڕنـەوە:** پیـاوێ هـەبوو لـە مەککـە سـاڵ دوازدەی مانگ بەڕۆژو دەبوو، کەس نەیدەدیت نان‌و ئاو بخـوات، کـاتێ مـەرگی خـودای بەجێ هێنا، دەستی لە گیرفانی نا (بسم اللـه الرحمن الرحیم)ی تیـادا بـوو کـابرای مـردوو شۆر سەری سوڕما کە ئەو پیاوە چەند ساڵە لەکاتی بەربانگ ئەو وەرەقـەی لەسـەر زاری دادە ناو ماچی دەکرد، ئینجا دەنگێك هات گوتی: بەهۆی وشەی (بسـم اللـه) پەروەردەمان کرد . بەهۆی وشەی الرحمن لێی خۆش بووین بەهۆی وشەی (الرحیم) بەردەوامان کرد.
- **١٨٣- ژنییەکانی بەهەشت: دەگێڕنەوە:** خودا فەرموویەتی: بەهەشت چوار ژنی لێیە، ژنـی هەنگوین، ژنی شیر، ژنی ئارەقی پاك، ژنی ئاوی سازگار.
- **١٨٤- سامانی ناڕوا نامێنی: دەگێڕنەوە:** پیاوێك شـیری دەفرۆشـت، بـەڵام فێڵـی لـەگـەڵ دەکرد، شیرەکەی لـەگەڵ ئاو تێکەڵاو دەکرد و دەیفرۆشت، جارێـك لـەنێو کەشـتی بـوو، مەیمونێکی لەگەڵدا بوو، مەیمونەکە دینارێکی دەخستە ناو ئاو و دینارێکیـشی تـێ هەڵـدەدا پێش کابرا تا پارەکەی نیوە بە نیوە کرد.
- **١٨٥- درۆی ڕەوا:** دەگێڕنەوە ئیبراهیم سێ درۆی کردووە!، دووانیان لەبـەر خـودا یـەکێك لەبەر خۆی، یەکەمیان کە گوتی: من نەخۆشم نایەمە سەیرانگای بتان، ئەمەی لەبەر خـودا بوو، دووهەمیان کە گوتی: بتە گەورەکە ئەم بتانەی شکاندوە، سێهەمیان کـە گـوتی: ئـەو ژنە خوشکمە ئەگەر بیگۆتبا ژنە لێیان دەسەند .
- **١٨٦- کەرامەتی پیاو چاکان: دەگێڕنەوە:** جارێك یەکێك لە پیاو چاکان، بەناوی سەوری خۆی دەشوشت، یەکێك جلەکانی رفاند، بەڵام دەستی لەکار وەسـتا لـە ترسـان هاتـەوە جلەکەی لە جێی جاران دانایەوە سەوری گوتی: خودایە ئەو جلکەی بۆ هێنامەوە دەسـتی

چاك بكەیەوە، یەكسەر دەستی چاك بوو.

- **١٨٧- پەشیمان بوونەوە لە نیازی چاك: دەگێڕنەوە** جارێك پیاوێك گوتی: ئەگەر خودا شتێكم پێدا دەیدەمە هەژاران، پیاوێك دینارێكی پێدا و گوتی: كورە خۆ منیش هەژارم نەیدا، یەكسەر تووشی نەخۆشی ددان بوو، یەك دوو ددانی دەرهێنا، دەنگێك هات گوتی: ئەگەر دینارەكە نەدەیە هەژاران دەبێ هەموو ددانەكانت دەربێنن.
- **١٨٨- گەورێتی زكر: دەگێڕنەوە: موسا پێغەمبەر** (ﷺ) گوتی: خودایە تۆ جێت لە كوێیە ؟ خودا فەرمووی لەنێو دڵی ئەوەی یادم بكات !!!

- **١٨٩- سێ ناوی خودا لەنێو بسم الله الرحمن الرحیم: دەگێڕنەوە** جارێك خودا بە موسای فەرموو: من رێزی ئومەتی پێغەمبەرم گرتووە، بەسێ ناو: ئەویش گوتی: خودایە ئەو سێ ناوە چین ؟ خودا فەرمووی: (بسم الله الرحمن الرحیم)كوێرێك لەوێ بوو گوتی: بۆ خاتری ئەم سێ ناوە چاوم چاك بكەی ! یەكسەر چاوی چاك بوو.
- **١٩٠- گوتنی یەك بسم الله الرحمن الرحیم (١٩٠) چاكە: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی كەسێك یەك پیت لە قورئان بخوێنێ خودا (١٠) چاكەی بۆ تۆمار دەكات، كەواتە (بسم الله الرحمن الرحیم) (١٩) پیتە × (١٠) یەكسانە بە (١٩٠) چاكە.
- **١٩١- كاتی دابەزینی بسم الله الرحمن الرحیم: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عەلی فەرموویەتی كاتی (بسم الله الرحمن الرحیم) دابەزی كێوەكان دەستیان بە زیكە زیك كرد، هەتا كافرەكان دەیانگوت محەمەد جادوی لێ كراوە!.
- **١٩٢- بەزەیی موسا: دەگێڕنەوە:** جارێك موسا پێغەمبەری خودا گوتی: خودایە وەسیەتم بكە خودا فەرمووی بەخشندە بە . لەپاش كەمێك باڵندەیەك هاتە ناو باخەڵی بازێكی لەدوا بوو بازەكە گوتی: بەرەڵلای بكە برسیمە، گوتی: بەرەڵلای ناكەم گوتی: گۆشتی رانت دەخۆم گوتی رازیم ،گوتی گۆشتی چاوت دەخۆم گوتی رازیم، باڵندەكە گوتی من میكائیلم ئەوی تریش گوتی: جبرائیلم بۆ تاقی كردنەوەی تۆ هاتبووین.
- **١٩٣- گەورەیی نزا: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی گەورەی هەموو نزایەك ئەم

نزایەیە (اللهم ربي لا اله انت خلقتني وانا عبدك وانا علي عهدك و وعدك ماستطعت، اعوذ بك من شر ما صنعت ابوء لك بنعمتك علي و ابوء بذنبي فاغفرلي فأنه لا يغفر الذنوب الا انت).

- **١٩٤- پاداشتی سورەی الاخلاص: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك (١) جار سورەتی (الاخلاص- بخوێنێ خودا خانوێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات.
- **١٩٥- نزای لاچوونی گرفت: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زۆر توشی بەڵاو ناخۆشی دەبم پێغەمبەر فەرموی هەموو بەیانییەك کە لەخەو هەڵسای بڵێ (بسم اللـه علـى نفسي و مالي و اهلي) خودا خۆت و ماڵت دەپارێزی، پیاوەکە وای گوت، یەکسەر خودا بەڵاو ناخۆشی لەسەر لادا.
- **١٩٦- یادی خوا لەخێر و جیهاد باشترە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرمووی شتێکتان پێ ئەڵێم چاکتر لەهەموو کارێکتان و پاك لەلای پەروەردگارتان کە پلە و پایەتان بەرز و بڵند تر دەکات چاکترە لەزێڕ کردنە خێر، هەروەها چاکترە لەوەی کە بگەنە دوژمن و لێی بدەن و لێتان بدات، گوتیان ئەو شتە چی یە پێغەمبەر فەرمووی، یادی خودا.
- **١٩٧- نزای ژانەسەر: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەری (ﷺ) خۆشەویستمان فەرموویەتی، ئەگەر یەکێك ژانە سەری تووشبوو. با ئەم نزایەی لەسەر بخوێنێ بسم الله الكبير، نعوذ بالله العظيم من شر عرق نعار و من شر من النار. (ابن سينا).
- **١٩٨- نزای ترسان لە میر: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستمان فەرموویەتی: ئەگەر لەکاربەدەست و میر ترسان، ئەم نزایە بکەن (لا الە الا اللـه الحليم الكريم، سبحان الله رب السموات السبع ورب العرش العظيم، لا اله الا انت عز جارك وجل ثنائك).
- **١٩٩- نزای ئاگر کوژانەوە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر شوێنێ سووتا ئەم نزایە بکەن (اذا رايتم الحريق فكبروا فان التكبير يطفئة) واتا ئەگەر شوێنێ سووتا اللـه اكبر بڵێن. چونکە بەهۆی ئەم زکرە ئاگرەکە دەکوژێتەوە.
- **٢٠٠- نزای خەم و پەژارە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویەتی ئەگەر خەم و پەژارە و کارێکی گرنگ ڕووی تێکردن ئەم نزایە بکەن لا الـه الا الله العظيم الحليم، لا الـه الا الله

رب العرش العظيم، لا اله الا الله رب السموات ورب العرش العظيم. (ب. م) .

- **٢٠١- بسم الله الرحمن الرحيم چوار وشەیە: دەگێڕنەوە:** زانایان دەڵێن بسم اللـه الـرحمن الرحيم، چوار وشەیە. تاوانەكانی مرۆڤیش چوار بەشە. بەشەو و ڕۆژ و ئاشـكرا و نهێنـی. جا كەسێك ئەم زكرە بكا، لەم چوار تاوانە دوور دەكەوێتەوە.
- **٢٠٢- شەیتان (بە نەفرەت بێ) چۆن لەڕو لاواز دەبێ؟: دەگێڕنەوە:** جارێـك دوو شـەیتان (بە نەفرەت بێ) بەیـەك گەیـشتن. یـەكێكیان قەڵـەو بـوو ئـەویتریان لاواز، قەڵەوەكـە بـە لاوازەكەی گوت: بۆچی ئەوەندە لاوازی ؟ گوتی: لـەلای پیـاوێكم لـە كـاتی خـواردن و خەوتن و گەڕانیدا . ناوی خوا دەهێنێ.
- **٢٠٣- لوقمان چۆن بوو بە پسپۆڕ؟ دەگێڕنەوە:** لوقمانی حەكیم جارێك پـەڕێكی دۆزیـەوە لێی نووسرابوو (بسم اللـه الرحمن الرحيم- ئەویش هەڵی گرتەوە تا نەكەوێتە ژێـر پێیـان . بۆیە بووە حەكیم.
- **٢٠٤- كەراماتی خالیدی وەلید دەگێڕنەوە:** خالیدی كوڕی وەلید كەوتە دەست كـافران و گرتیان: گوتیان: كەراماتێكمان نیشان نەدەی دەت كوژین. ئەویش گوتی: ژەهرم بـدەنێ. كە ژەهرەكەی خوارد . هیچی لێنەهات. گوتیان ئەوە چۆن؟ گـوتی: (بـسم اللـه الـرحمن الرحيم)م لەسەر خوێندووە.
- **٢٠٥- زوو گیرا بوونی نزا: دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاكێك كەسێك بنووسێ (بسم اللـه الـرحمن الرحيم من عبده الذليل الى ربه الجليل) لە پاشاندا بیهاوێتـە نـاو ڕووبارێـك خـودا دەسـت بەجێ نزای گیرا دەكات.
- **٢٠٦- فریشتە پاداشتی هەموو زكرێ نازانن:** دەگێڕنەوە: الحمد لله حمداً كثيرا طيبـا مباركـا فيه كما يحب ربنا و يرضـي. پێغەمبـەر (ﷺ) بـەو خودایـەی گیـانی منـی بـە دەسـتە. دە فریشتەی خودا هاتن بۆ ئـەوەی پاداشـتی ئـەم زكـرە بنووسـن، بـەلام نـەیانتوانی!، خـودا فەرمووی: بەندەی من چی دەوێت، ئەوی بۆ بنووسن. (صحيح. ابن حبان).
- **٢٠٧- كۆی هەموو سوپاسێك: دەگێڕنـەوە:** كـاتێ ئـادەم پێغەمبـەر(ﷺ) هاتـە سـەر زەوی فەرمووی: خودایە فێرە كارم بكە و فێرە سوپاسم بكە. خودا فـەرمووی: هـەموو ئێـوارە و

بەیانیان سێ جار بڵێ: الحمد لله حمدا یوافی نعمه و یکافی ء مزیده. کۆی هەموو سوپاسێکە.

- ٢٠٨- **زمان بۆ باوەڕدار بەسە: دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێکی بێ دەست و پێ و زامدار، زەنگەسۆرە گۆشتی دەخوارد لەسەر ئەم بەزمە دەیگوت: خودایە زۆر سوپاست دەکەم، کەمنت گەورە کردووە لەسەر زۆر کەسان. پیاوێك گوتی قوڕت بەسەر تۆ دەزانی چیت بەسەر هاتووە، ئەویش گووتی هەی ماڵ کاول خۆ زمانم ماوە!!!!
- ٢٠٩- **گیرا بوونی تەوبەی تاوانباری: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هەمیشە ئارەقی دەخواردەوە. ئەوەندەی ئامۆژگاریان دەکرد سوودی نەبوو. ڕۆژێك بۆناو کۆڕێکی ئامۆژگاری چوو. زانایەکە دەیگوت: هەر کەسێك درووديێك لە پێغەمبەر (ﷺ) بدات. ئەوا خودا دە دروودی لەسەر لێ دەدات. ئەویش یەکسەر بە دەنگی بەرز دەستی بە درووود لێدان کرد. خەڵکەکە هەموویان لەدوایان دەگوتەوە. کە مرد دیتیان وا لە بەهەشتە گوتیان: چۆن هاتیتە بەهەشت ؟ گوتی لەکاتی درووودەکە خودا لێم خۆشبوو.
- ٢١٠- **سامانی ناڕەوا بەخێر ناچێ: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: بەهۆی بازرگانی ئارەق سامانێکی زۆرم وەدەست کەوتووە، ئێستا هەندێ لەو پارەیە بکەم بەخێر خێرم پێدەگات ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی نەخێر!.
- ٢١١- **زەرەرترین فرتێنە دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەپاش خۆم هیچ فرتێنەیەکم جێ نەهێشتووە بۆ پیاوان زەرەرمەندتر بێ وەك ژنان. هۆی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بوو، پیاوێك لە کۆچکاران لەبەر ژنێ کۆچی کرد. نەك کۆچ بۆ خودا.
- ٢١٢- **پاداشتی نیازی چاك: دەگێڕنەوە** پیاو هەیە لە دوا ڕۆژ چاکەی هەیە بە ئەندازەی کێوێك، خودا بە بەندەکانی دەڵێت: هەر کەسێ مافی لەلای ئەو پیاوەیە با بچێ لێی وەرگرێتەوە. بەندەکان دەچن. تا کابرا هیچی نامێنێ سەری لەمە سووڕ دەمێنێ، خودا پێی دەڵێ هەر نیەتێکی چاکت هەبوویێ بۆم کردوویت بە هەفتا چاکە.
- ٢١٣- **تاوانی ڕیش سپی: دەگێڕنەوە:** جارێك پێشەوا (عومەر- بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)

چوو پێغەمبەر (ﷺ) دەگریا. پێشەوا عومەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا بۆ دەگریت ؟ فەرمووی: تازە جبریل هات گوتی: خوا سلاوت لێ دەکا و دەڵێت من شەرم دەکەم ریش سپی ئازار بدەم . جا ئەی پێشەوا عومەر نازانم چۆن ریش سپی شەرم لە خودا ناکەن.

- **٢١٤- پێغەمبەر (ﷺ) و پێشەوا عەلی: دەگێڕنەوە:** جارێك پێغەمبەر (ﷺ) بە پێشەوا عەلی گوت: ئەی عەلی هەموو خەمێك دەروات، جگە لە خەمی دۆزەخیان، جگە لە شادی بەهەشتیان. کورە هەر کاتێ تاوانت کرد زوو پەشیمان ببەوە.
- **٢١٥- تەوبە گیرایە تا گیان نەگاتە قورقوڕاگە: دەگێڕنەوە:** لەسەرە مەرگی پێغەمبەر (ﷺ) جبریل هاتە لای و گوتی خودا فەرموویەتی: نەتەوەکەت ئەگەر یەکێکیان ساڵێك لەپێش مەرگیدا تەوبە بکات لێی گیرا دەکەم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ساڵێك زۆرە جبریل بۆ بارەگای خودا چوو، خودا فەرمووی: بۆم کردنە مانگێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مانگێ زۆرە؟ خودا فەرمووی بۆم کردنە هەفتەیەك. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەفتەیەك زۆرە. خودا فەرمووی، بۆم کردنە رۆژێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: رۆژێ زۆرە. خودا فەرمووی، لەپێش ئەوەی گیان بگاتە قورقوڕاگەیان.
- **٢١٦- ئومێدی چاکە: دەگێڕنەوە:** لەسەرە مەرگ بە عەرەبێکیان گوت: تۆ دەمری؟ گوتی: باشە بۆ لای کوێم دەبەن ؟ گوتیان خودا گوتی: جا جگە لە چاکە هیچی تری لێ دیتراوە.
- **٢١٧- سەرزەنشت بێنی گەندەیە: دەگێڕنەوە** لە جابیری عەبدوڵلا، دەڵێ ئێمە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) بووین. بۆنێکی پیس هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن ئەو بۆنە ناخۆشە چییە؟ گوتمان نەخێر. فەرمووی: بۆنی زاری غەیبەت کەرانە.
- **٢١٨- غەیبەت لە دامەن پیسی خراپترە: دەگێڕنەوە:** لەجابیر دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: غەیبەت لە دامەن پیسی خراپترە. گوتمان لەبەر چی ؟ گوتی: ئەگەر زیناکەر تەوبە بکا، بۆی هەیە خودا لێی خۆش بێ. بەلام غەیبەت مافی خەڵکە تا خاوەنەکەی گەردنت ئازاد نەکات، خودا لێت خۆش نابێ.
- **٢١٩- دڵ رەنجانی درێژ خایەن: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر دوو موسوڵمان لەماوەی سێ رۆژ قسە لەگەڵ یەکتر نەکەن، ئەوە هەر یەکێکیان بمرێت

دۆزەخیە. ئەگەر بووە سالێك، ئەوە وەك کوشتن وایە. مەگەر توورە بوونەکە، لەسەر شتێکی شەرعی بێت.

- ٢٢٠- **ناوهێنانی خەڵك چاکە دەبا:** دەگێرنەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەدوا رۆژ پیاو هەیە چاکەی نییە. داوا لە خودا دەکات. نوێژم رۆژووم، چیان بەسەر هات؟ خودا دەفەرموێ ناوی خەڵکت هێنا بوو.
- ٢٢١- **خەڵك ناوت بهێنن قازا نجتە:** دەگێرنەوە: پیاو هەیە لەدوا رۆژ چاکەی زۆرو زەبەنە. دەڵێ خودایە من ئەو چاکانەم نەکردووە ؟ خودا دەفەرمووێ، راستە بەڵام خەڵك ناویان هێنای.

- ٢٢٢- **ناوهێنان؛ دەگێرنەوە:** ژنێ بۆ لای مەلایەك چوو گوتی: قوربان پرسیارێکم هەیە ؟ بەڵام شەرم دەکەم لەبەر ئەوەی کۆرەکە ئاوەدانە. مەلا گوتی شەرم لە پرسیاری ئایینی نییە. گوتی من شەوێ خەوم لێکەوتبوو باوکم سوارم بوو، منداڵێکم لێ بوو. چارەم چیە مامۆستا کە گوتی: وام زانی ناوی خەڵکت هێناوە.
- ٢٢٣- **خودا زانای خۆش دەوێت؛ دەگێرنەوە:** خودا پەیامی بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر(ص) رەوانە کرد فەرمووی: من خۆم زانام هەموو زانایەکم خۆش دەوێت.
- ٢٢٤- **خێری لەبەر کردنی چل فەرموودە؛ دەگێرنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك چل فەرموودەی من بەرەوانی لەبەربکات.من لە رۆژی دوایی تکای چوونەبەهەشتی بۆ دەکەم.
- ٢٢٥- **زانا و سەرۆك:** دەگێرنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: دوو چین لەگەلی من. ئەگەر ئەوانە چاك بن، خەڵك هەموو چاك دەبن.ئەوانیش مەلا و سەرۆکن!.
- ٢٢٦- **گەورێتی مزگەوت؛ دەگێرنەوە:** لەدوا رۆژ دەستەیەك ناوێرن لە پردی (صراط) بپەرنەوە جبیرل دەڵێ بۆ ناپەرنەوە دەڵێن: دەترسین، دەڵێ لە دونیادا چۆن لە دەریا دەپەرینەوە ؟ دەڵێن بەهۆی کەشتی. ئەویش دەڵێ بە مزگەوتەکان بپەرنەوە کە لە دونیا نوێژتان لێیان دەکرد.

- **٢٢٧- زکری لاحول ولاقـوە الا باللـە: دەگێڕنـەوە:** جارێـك (عـەوف مالیـك- هاتـە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: سالمی کـوڕم بـەدیل گـیراوە. خێزانەکـەم زۆر دڵ تەنگـە. خۆمـان هەژارین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئارامبە و زۆر زکری لاحول ولا قـوە الا باللـە بکـەن، دەڵێن لەپاش چەند رۆژێك کافرەکان ئاگایان لـە سالم براو سالم رای کرد، مەڕێکی زۆریشی لەگەڵ خۆی هێنا. ژمارەیان چوار هەزار مەڕ پتر دەبوو.
- **٢٢٨- کێ بەهێزە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی:ئەوکەسـە بـەهێز نیـە، لـەکاتی شەڕ و شۆڕتوشبون خەڵك لەعاردی دەدات ئەو کەسـە بـەهێزە کـە بـە دەروونـی خـۆی دەوەستێ!!!
- **٢٢٩- باشترین موسڵمان: دەگێڕنەوە لە** (ئەبو موسای ئەشعەری- گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خودا باشترین موسوڵمان کێ یە ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی ئەو کەسەیە موسڵمانان لـە دەست و زمانی ئەمین بن.
- **٢٣٠- مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: مـافی موسڵمان پێنج شتە: وەڵام دانەوەی سەلام و چوونە لای نەخۆش و بەدوا کـەوتنی تـەرم و چوونە سەر داوەت و ئەگەر پێ کژی و گوتی (الحمد للـه) گوتنی خوا رەحمت پێ بکا.
- **٢٣١- نزای مردن نا پەسندە: دەگێڕنـەوە:** پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: نەکـەن داوای مەرگ بکەن. چونکە ئەوەی داوای مەرگ دەکات، ئەگەر خراپ بێ، ئومێـد هەیـە چـاك بێ، ئەگەر چاکیش بێ ئەوا چاکەی زیاتر دەبێ. (م).
- **٢٣٢- خێر و چاکە دەگاتە مردوو: دەگێڕنەوە:** لە عائیشە گـوتی: پیاوێـك بـە پێغەمبـەری (ﷺ) گوت: ئەی پێغەمبەری خـودا. دایکـم دەسـت بـەجێ مـرد. بـەڵام ئەگـەر قـسەی کردبوایە نیازی خێر کردنی هەبوو. ئەگەر خێری بۆ بکەم پێی دەگـات ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. (ب. م).
- **٢٣٣- رۆژو و هەر برسیەتی نییـە: دەگێڕنـەوە:** پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: کەسـێك بەڕۆژ و بێت و لـە قسەی درۆ و دەلەسە نەگەڕێتەوە. ئەوا خـودا رۆژووەکـەی لـێ گـیرا ناکات.

- **٢٢٤- ئەگەر باوەڕداری: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر باوەڕت بەخودا و زیندوو بوونەوە هەیە، قسەی خێر بکە. ئەگینا کڕو کەپ بە. ڕیزی هاوسێ بگرە. هەروەها ڕێزی میوان بگرە. ب. م.
- **٢٢٥-خێری شەشەلان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ و ئەوجا شەشەلانیش بگرێ. ئەوا خێری ڕۆژووی ساڵێکی بۆ دەنووسرێ.
- **٢٣٦- نزای پێغەمبەر** (ﷺ) بۆ نەخۆشان: دەگێڕنەوە: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە لای نەخۆش، ئەم نزایەی دەخوێند. اذهب البأس رب الناس اشف أنت الشافي لا شفاء ك الا شفاء شفاء لايغادر سقما. ٣ جار.(م)
- **٢٣٧- بکوژو کوژیاری موسوڵمان دۆزەخین: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر دوو موسڵمان بەشمشێرەوە بەرابەر یەکتر ڕاوەستان هەردووکیان دۆزەخین گووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا بکوژەکە هەقی خۆیەتی. ئەی کوژراوەکە لەبەر چی ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چونکە لەسەر کوشتنی ڕشت و سوورە.
- **٢٣٨- چاکەی موسوڵمان و کافر: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر موسڵمان چاکەیەك بکات، ئەوا خودا بۆ دوا ڕۆژی هەڵدەگرێ و لەبۆ دونیای ڕۆژی لەدوایە. بەڵام کافر تەنها لە دونیا، پاداشتی پێی وەردەگرێ.
- **٢٣٩- گزیکار لە ئێمە نییە: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) بەلای پیاوێ تێپەڕی دانەوێڵەی دەفرۆشت. ئەویش دەستی لەناو ڕاکرد دەستی هەموو تەڕ بوو. فەرمووی بۆ دانەوێڵە تەڕ بووەکە ناخەیە دەرەوە، ئەوەی گزی بکات لە ئێمە نییە.
- **٢٤٠- چۆن خودا و خەڵك خۆشتیان دەوێ ؟ دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کارێکم پێ بڵێ کە خودا و خەڵك منیان خۆش بوێ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جیهان بەکەم بزانە خودا خۆشتی دەوێ. ئەو شتەی خەڵك هەیتی بە کەمی بزانە خەڵك خۆشتی دەوێ!.
- **٢٤١- دوو ڕوویی: دەگێڕنەوە:** موسا پێغەمبەر سێ ڕۆژ لەبەر خودا پاڕایەوە فەرمووی: خودایە بارانمان بۆ بارێنە، خودا فەرمووی یەکێکتان تیا دایە دوو ڕووە بۆیە بارانتان بۆ

ناباریێم. موسا پێغەمبەر فەرمووی خودایە: ئەو دوو ڕووە، کێ یە ؟ خودا فەرمووی: ئەی موسا: من دەڵێم لەبەر دوو ڕوویێك باران نابارێ، تۆ دەتەوێ بکەیە دوو ڕوو!. جا موسا بە خەڵکەکەی گوت: هەمووتان لە دوو ڕوویی پەشیمان ببنەوە. یەکسەر باران باری.

- **٢٤٢- چاکە و خراپە بە زایە ناچن: دەگێڕنەوە:** پیاوێکیان لەخەو دیت گوتیان خودا چی لەگەڵ کردی ؟ گوتی بردمیە لای تەرازوو چاکە و خراپەی کێشام. خراپەم کەمێك پتر بوو زۆر دڵتەنگ بووم. کیسەیەك کەوتە ناو تەرازووەکە ئیمجا چاکەم پتر بوو. گوتم: ئەو کیسەیە چی یە ؟ گوتیان ئەوە خۆڵی تیادایە کە جارێك بە دوای تەرمێك کەوتی لە کاتی شاردنەوە، چەنگە خۆڵێکت بەسەر گۆڕەکەدا کرد.
- **٢٤٣- مارەیی دایکە حەوا: دەگێڕنەوە:** کاتێ خودا دایکە حەوای هەر لە ئادەم دروست کرد. ئادەم ویستی بچێتە لای. خوا فەرمووی: نەکەی بچیە لای هەتا مارەیی نەدەی. گوتی مارەیی چی یە ؟ خودا فەرمووی: ١٠ سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر محەمەد (ﷺ) بدە.

- **٢٤٤- گەورێتی پێغەمبەر (ﷺ) و نەتەوەکەی: دەگێڕنەوە:** کاتێ خودا دەرگەی بەهەشتی لە ئادەم کردەوە. ئادەم نواڕی لە عەرشی خودا نووسراوە: (لا الە الا اللـە محمـد رسول اللـه). فەرمووی خودایە: ئەوە کێ یە ؟ خودا فەرمووی: ئەوە پێغەمبەرێکە لە نەتەوەی تۆ کەس لە ئەو گەورەتر نیە. ئۆمەتەکەشی لە هەموو ئۆمەتەکان گەورەترن.
- **٢٤٥- مافی دایك و باوك: دەگێڕنەوە:** بۆنی خۆشی بەهەشت ٥٠٠ ساڵە ڕێ دەڕوات. بەڵام ئەوەی لەگەڵ دایك و باوکی خراپ بێ . لەو بۆنە خۆشە بەرییە.
- **٢٤٦- ئۆف گوتن بە دایك و باوك تاوانە: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عەلی فەرموویەتی: ئەگەر خودا شتێکی لە ئۆف خراپتر هەبوایە بەرابەر دایك و باوك، ئۆفی نەدەگووت!.
- **٢٤٧- کوڕێکی چاك: دەگێڕنەوە:** جارێك باوکێك داوای ئاوی لە کوڕەکەی کرد. لە پاشاندا خەوی لێکەوت، کوڕەکەی تا بەیانی پەرداخە ئاوەکەی لە دەستدا بوو، دڵی نەهات باوکی بە ئاگا بهێنێ.
- **٢٤٨- پاداشت دانەوەی باوان پایانی نییە: دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای پێشەوا عومەر

فەرمووی من دایکێکم هەیە لە پشتی دەکەم. پاشەڕۆی پێ دەکەم. تۆڵەی خۆم کردۆتەوە؟ فەرمووی: نەخێر چونکە ئەوان کە تۆیان بەخێو دەکرد. چاوەڕێی تەمەن درێژیت بوون. بەڵام تۆ چاوەڕێی مەرگیانی!..

- **٢٤٩- ٣ خۆشی: دەگێڕنەوە:** لە زانایان سێ شت خۆشە. بینی منداڵ و دیتنی دۆست و ڕابواردن لەگەڵ ژنی خۆت.
- **٢٥٠- لە بەندە جووڵە لە خودا ڕۆزی: دەگێڕنەوە:** لە تەورات نووسراوە ئەوەی دەستی بجوڵێنی واتا کار بکا خودا ڕۆزی دەدا.
- **٢٥١- سێ شت بەدوای تەرم دەکەوێ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سێ شت بەدوای تەرم دەکەوێ سامان و خێزان و کردەوەی. تەنها کردەوەی لەلای دەمێنێ.
- **٢٥٢- جیاوازی مەرگ و خەوتن: دەگێڕنەوە:** بەزانایەکیان گوت: جیاوازی چی یە لە نێوان خەوتن و مەرگدا ؟ فەرمووی خەوتن مردنێکی سووکەڵەیە. مەرگ مردنێکی گرانە.

- **٢٥٣- هۆش لە ئەدەب باشترە: دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لە عەبدوڵڵای عەباس کرد، ئایا هۆش باشترە. یا ئەدەب؟ فەرمووی هۆش، چونکە هۆش لە خودایە. بەڵام ئەدەب لە بەندەوەیە.
- **٢٥٤- بەختیاری مرۆڤ پێنج شتە: دەگێڕنەوە:**لە پێشەواعەلی فەرموویەتی: بەختیاری مرۆڤ پێنج شتە ژن ومنداڵی چاك و هاوسێ و دۆستی چاك، هەروەها لە شارەکەی خۆی کاربکا.
- **٢٥٥- ئارەق خواردنەوە: دەگێڕنەوە:** لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کەسێك لە جیهاندا ئارەق بخواتەوە لە دوا ڕۆژ نایخواتەوە.
- **٢٥٦- بووك و زاوا: دەگێڕنەوە:** زاوایەك لە پێش ئەوەی بچێتە لای بووکی گوتی منت خۆش دەوێ گوتی بەڵێ: کەواتە هەر جارێ تووڕەم کردی دڵت دەدەمەوە. ئەگەر تووڕەشت کردم دڵم بدەوە گوتی: بەڵێ.
- **٢٥٧- کەعب و پێناسەی ئارەق:** دەگێڕنەوە: کەعبی ئەحبار فەرموویەتی: من پەرداخێك ئاگرم پێ خۆشترە لە ئارەق.

- **٢٥٨- پەرتەوازەی جولەکە و دیان و موسڵمان**: دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: جولەکە و دیان بوونە هەفتا و دوو چین، ئۆمەتی منیش دەبێتە هەفتاو سێ چین. گشتی بۆ دۆزەخە . مەگەر ئەوەی لەسەر ڕێبازی من بێ. خودا پەنامان بدات. ئامین، کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە !! تا ڕۆژی ترش.
- **٢٥٩- ڕیزی هۆزی ئەشعەری لای پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: چاکترین هۆز ئەشعەرییە من لە ئەوانم، ئەوان لە منن لە جەنگ نابەزن. لە سامانی جەنگ گزی ناکەن.
- **٢٦٠- پێغەمبەر (ﷺ) و مەعاز: دەگێڕنەوە**: کاتێ پێغەمەر (ﷺ) مەعازی ڕەوانەی شام کرد بۆ مەلایەتی فەرمووی باخودا بەیەك بزانن و هەر پێنج نوێژەکە بکەن. (ب).
- **٢٦١- پێغەمبەر (ﷺ) و جوولەکە و دیان: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەو کەسەی گیانی محەمەدی لە دەست دایە هەر جولەکە و دیانێ باوەڕی بەو بەرنامەیەی من نەبێ ئەگەر بمرێ دۆزەخییە.
- **٢٦٢- تفەرك: دەگێڕنەوە**: ئەسما دەفەرموێ ئێمە هەموو جارێ کە نەخۆش دەکەوتین، کەوا کەی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەناو ئاو دەنا بە ئاوەکە خۆمان دەشووشت. تاکو خودا چاکمان بکاتەوە.
- **٢٦٣- پێنووسی خودا: دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر فەرموویەتی: خودای گەورە ئەندازەی هەموو بوونەوەرێکی نووسیوە، لە پێش ئەوەی ئاسمان و زەمین دروست بکات بە ٥٠ هەزار ساڵ.
- **٢٦٤- کەنیزەیەك و پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر (ﷺ) بە کەنیزەیەکی گوت: خودا لەکوێ یە ؟ گوتی لە ئاسمان . گوتی من کێم ؟ گوتی تۆ پێغەمبەری خودای. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئازادی بکەن ئەوە موسوڵمانە.
- **٢٦٥- پۆشینەی سپی: دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: پۆشینەی سپی بپۆشن. چونکە بەڕاستی باشترین پۆشینەیە. مردووەکانیشتان لەو پۆشینە بپۆشن. واتا: کفن. (صحیح الحاکم).
- **٢٦٦- پۆشینەی سەوز: دەگێڕنەوە**: لەئەبی ڕەمە سەی ڕەفاعەی تەمیمی گوتی: پێغەمبەرم

(ﷺ) دیت دوو پۆشینەی سەوزی پۆشیبوو. (د. ت. صحيح).

- **٢٦٧- مێزەری ڕەش: دەگێڕنەوە:** لەگێڕانەوەیەکی پێشەوا موسلیم. پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا مێزەرێکی ڕەشی لەسەر کردبوو.
- **٢٦٨- لقەکانی باوەڕ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: باوەڕتان هەبێ بە خودا و فریشتە و پەرتووکەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەزا و قەدەر. (ب. م).
- **٢٦٩- لقەکانی ئیسلام: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لقەکانی ئیسلام ئەمانەن: شادە و نوێژ و ڕۆژوو زەکات و حەج. (ب. م).
- **٢٧٠- ژمارەی پێغەمبەران: دەگێڕنەوە:** ئومامە پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (١٢٤) هەزار، گوتی چەندیان ڕەسوول بوونە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (٣١٥ یا ٣١٣) (ئیبن حبان. الحاكم).
- **٢٧١- خۆشەویستترین پۆشینە لای پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە:** لە ئومو سەلەمە گوتی: خۆشەویسترین پۆشینە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) چاکەت بوو.
- **٢٧٢- زێڕ و هاوریشم بۆ پیاو ناڕەوایە: دەگێڕنەوە:** لە ئەبو موسای ئەشعەری گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: پۆشینەی هاورِیشم و زێڕ لە نێرینەکانی گەلەکەم ناڕەوا کراوە. بەڵام لە مێینەکان ڕەوا کراوە.
- **٢٧٣- خانووی هاوەڵان: دەگێڕنەوە:** کاتێ سەعدی وەقاس کاربەدەست بوو لە کوفە. نامەیەکی ڕەوان کرد بۆ پێشەوا عومەر نووسی من خانووم نییە. پێشەوا عومەر گوتی: خانوێك بکە لە گەرمی ڕۆژ و باران بتپارێزی.
- **٢٧٤- ڕق لێ بوونەوەی ژن لە مێرد: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر شەوێ ژن سەر جێی مێردەکەی بە جێبێڵێ و لەگەڵی نەخەوی و دڵی بشکێنی، فریشتە هەتا بەیانی نەفرەتی لێ دەکەن.(ب. م).

**٢٧٥-نابێ ژن بەڕۆژوو بێ بەبێ ڕای مێردی:** دەگێڕنەوە: لە ئەبو هورەیرە گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی بۆ هیچ ژنێ ڕەوا نیە، ڕۆژووی سوننەت بگرێ بەبێ پرس و ڕای مێردەکەی.

- **٢٧٦- دۆستی ڕووخۆش و ناخۆش: دەگێڕنەوە:** لە یەکێك لە پیاو چاکان گوتی: پیاوێکی خراپ ڕووی خۆش بێ، لام چاکترە لە پیاوێکی خودا ناس ڕووی ناخۆش بێ.
- **٢٧٧- ستەم: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵڵای کوڕی پێشەوا عومەر گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ستەم بۆ ڕۆژی دوایی تاریکیە.
- **٢٧٨- شێوەی موسوڵمان بۆ موسوڵمان: دەگێڕنەوە:** لە ئەبو موسای ئەشعەری گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: موسڵمان بۆ موسوڵمان وەك خشتەکانی دیوارە هەر خشتێ ئەوی تری ڕاگرتووە. لە پاشاندا پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەکانی لەناو یەکتر نا.
- **٢٧٩- سۆزی موسوڵمان بۆ موسوڵمان: دەگێڕنەوە:** لە نوعمانی بەشیر گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئەندامی جەستەی ئازار بکا، هەموو جەستەی ئازار دەکات. موسوڵمانان بۆ یەکتر دەبێ ئاوا بن.
- **٢٨٠- داپۆشینی عەیب و عاری موسلمان: دەگێڕنەوە** لەئەبو هورەیرە گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ جلك بۆ موسڵمانێك بکات، خودا لە ڕۆژی دوایی جلی بەهەشتی لەبەر دەکات.
- **٢٨١ - چۆنیەتی لێدان لە ئارەق خۆر: دەگێڕنەوە:** لە ئەبوهورەیرە، وەپیاوێکی ئارەق خۆریان هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ) هەر یەکێ لە هاوەڵان بەشێ لێیان دەدا بە سۆڵە. بە دەست . بە جلك... هەندێ گوتیان خودا ڕیسوات بکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەو قسەیە مەکەن، کە ببنە یارمەتیدەری شەیتان (بە نەفرەت بی). (ب).
- **٢٨٢- شێوەی خەوتن و لەخەو هەڵسانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕنەوە:** لە حوزەیفەی یەمانی گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ دەخەوت دەستی لەژێر کوڵمەی خۆی دادەنا و دەیگوت: ئەی خودایە بەناوی تۆوە دەمرم و زیندوو دەبمەوە کاتێکیش لەخەو هەڵدەستا دەیگوت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە لە پاش مردن زیندووی کردمەوە.
- **٢٨٣- کۆڕی بێ زیکر: دەگێڕنەوە:** لە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێ لە کۆڕێ هیچ ناوی خودا نەهێنێ. هەروەها لەکاتی خەوتن هیچ ناوی خودا نەهێنی ئەوە بۆی دەبێتە کەم و کوڕی.

- **٢٨٤- دوو نازی پەنهان: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵڵای عەباس گوتی: دوو نازی خودا زۆر کەس ئاگایان لێیان نیە، تەندروستی و وەخت بە دەست بوون.
- **٢٨٥- دڕك لە جەستە ڕاچوون: دەگێڕنەوە** لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی موسڵمان هەر ناخۆشیەکی بێتە سەر، خودا تاوانی پێ ڕەش دەکاتەوە هەتا دڕکێك لە جەستەی ڕابچێ تاوان ڕەش دەکاتەوە.
- **٢٨٦- دەرۆزە خراپە :دەگێڕنەوە** لەئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:ئەگەر یەکێك لەئێوەکۆڵە دارێك لە پشتی بکا چاکترە بۆی، نەك دەرۆزە بکا.جا پێی بدەن یا پێی نەدەن !!
- **٢٨٧- لەچەری بە دووکەس دروستە: دەگێڕنەوە** لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دوو کەس دروستە حەسوودی پێ ببەی یەکەم: دەوڵەمەندی کە هەمیشە خێرکەر بی. دووهەم مەلایەك کە زانا بێ و ئامۆژگاری خەڵك بکا.
- **٢٨٨- باشترین حەج: دەگێڕنەوە:** لە ئەبوبەکری سەدیق: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باشترین حەج چییە؟ فەرمووی دوو شتە لەکاتی (لبیك) دەنگت بەرز بکەیت و حەیوان بکوژیەوە.
- **٢٨٩- گەورێتی حەج:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: حەجێ بە سامانی ڕەوا بێ . چاکترە لە دونیا و ئەوەی لە دونیا دایە. جگە لە بەهەشت پاداشتەکەی چیتر نییە .( ت . ئیبن ماجە).
- **٢٩٠- حەج دەتکاتە منداڵی ساوا: دەگێڕنەوە** لە ئەبو هورەیرە گوتی پێغەمبەر (ﷺ)؛ فەرمووی کەسێك حەج بکا و لە پاشاندا کاری خراپ تەرخ بکا وەك منداڵی ساوای لێدێت . (ب. م).
- **٢٩١- غەزای سێ کەس: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:غەزای پیرەمێردوبێهێزوژن چوونە حەجە!!(ن.حسن).
- **٢٩٢- زوو چوونە حەج: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك دەیەوێت حەج بکا با پەلە بکات. چونکە لەبەر نەخۆشی و نەمانی لێخوڕ و هەبوونی پێویستی (احمد.

البیهقی. الطحاوی. ئیبن ماجە).

• **٢٩٣- سێ کاری چاك: دەگێڕنەوە** پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد چاکترین شت چی یە لە ئیسلامدا فەرمووی: باوەڕ بە خودا و پێغەمبەر، گوتیان لە پاشاندا؟ فەرمووی: خەبات لە ڕێی خودا دا. گوتیان لە پاشاندا فەرمووی: حەج بە سامانی ڕەوا.(ب)

• **٢٩٤- ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە: دەگێڕنەوە:** لە پێشەوا عومەر جارێ (حەجەرول ئەسوەد)ی ماچ کرد و گوتی ئەی بەردە ڕەش، ئەگەر خۆم نەم دیبوایە پێغەمبەر (ﷺ) ماچی دەکردی، ماچم نەدەکردی. چونکە تۆ زیان و قازانجت نییە.

• **٢٩٥ حەج بۆ خۆت بکە: دەگێڕنەوە:** پیاوێ لەلای پێغەمبەر (ﷺ) دەیگوت، خودایە مـن وا (لبیك) دەکەم لە جیاتی (شبرمە)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی، چی تۆیە ؟ کابرا گوتی: برامە: یا خزمە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تۆ خۆت حەجت کردووە؟ گوتی: نەخێر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی حەج بۆ خۆت بکە. ئینجا بۆ شبرمەی بکە.

• **٢٩٦- نەچوونە حەج بە ئەنقەست: دەگێڕنەوە:** لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کەسێك خواردن و لێخوڕی هەبێ. بە ئەنقەست حەج نەکا، ئەوا بە جولەکەیی یا بە دیانی دەمرێت.

• **٢٩٧- حەجی ژنان: دەگێڕنەوە:** لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئایا ژن غەزای لەسەرە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ. غەزای بێ جەنگ، ئەویش حەج و عەمرەیە. (صحیح).

• **٢٩٨- پێنج کاری چاك- دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی پێنج شت زۆر کۆن و لەمێژن. سونەتن. بەر تراشین. سورانە کردن. بەر سمێڵ کردن دەرکێشانی مووی بن هەنگڵ. نینۆك کردن. (ب.م).

• **٢٩٩- دەست و ڕووی ژن شەرمگە نییە دەگێڕنەوە:** لە عائیشە: پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: کاتێ ژن باڵق بوو هەمووی شەرمگەیە. جگە لە دەست و ڕووی.

(رواه أبو داود و له شاهد من حدیث اسماْ بنت عیسي من روایة البیهقی).

• **٣٠٠- چوار نیشانەی جیهان وێران بوون: دەگێڕنەوە:** لە ئەنەسی مالیك گوتی: پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی هەندێ شت لە نیشانەکانی جیهان وێرانبوون ئەمانەن: نەمانی زانست، بوونی نەفامی،خواردنەوەی ئارەق، دامەن پیسکردن بەئاشکرا. (ب).

- **٣٠١- بەردەوامی لەسەر ئیسلامەتی: دەگێڕنەوە:** پیاوێك بەناوی ئەبی عەمر یا ئەبی عەمرە بە پێغەمبەری (ﷺ) گوت: قسەیەکم پێ بڵێ لە ئیسلامدا بەکەسی تری نەڵێم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڵێ باوەڕم بە خودا هێنا و لە پاشاندا بەردەوام بە.
- **٣٠٢- ڕەحمەتی خودا لە پیاوی نەرم- دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لەو پیاوەی کە لەکاتی کڕین و فرۆشتن و قەرد دانەوە نەرمە.
- **٣٠٣- زکری سەرە مەرگ: دەگێڕنەوە:** لە ئەبی سەعید و ئەبی هورەیرە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لا الە الا اللە) بە نەخۆشەکانتان بکەن لەسەرە مەرگ. (م).
- **٣٠٤- خواردنی نانی پرسە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)- دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵڵای جەعفەر گوتی: کاتێ جەعفەری ئەبو تالیب شەهید کرا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی خزم و هاوسێیان خواردەمەنی بۆ ماڵی جەعفەر دروست بکەن. (ت. ئبن ماجە).
- **٣٠٥- نزای چوونە سەرگۆڕ- دەگێڕنەوە:** لە بورەیدا، پێغەمبەر کاتێ دەچووە سەر گۆڕ ئەم نزایەی دەخوێند (السلام علیکم اهل الدیار من المؤمنین والمسلمین وانا ان شاء اللە بکم لاحقون، نسأل اللە لنا ولکم العافیە. (م).
- **٣٠٦- بەخشندەیی خودا لە پێش قینیەتی: دەگێڕنەوە:** لە ئەبوهورەیرە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێ خودا بوونەوەرەکانی دروست کرد . لە نامەیەك نووسیویەتی نامەکە لەسەر تەختی خۆیەتی (بەڕاستی بەخشندەم لە پێش ڕق و قینم دایە. (ب. م).
- **٣٠٧ چوونە لای ژنی خۆت چاکەیە:** لە ئەبو زەر گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: یەکێك لە ئێوە کە دەچێتە لای ژنەکەی. خودا چاکەی بۆ دەنوسێ. یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە لەبەر حەزی خۆمان دەچین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی باشە ئەگەر بچنە لای ژنی خەڵك تاوان و بۆ نانوسری؟گوتیان بەڵێ گوتی کەواتە خێرە.
- **٣٠٨- چاکی عائیشە: دەگێڕنەوە** لە ئەنەسی مالیك. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فضل عائشة على النساء كفضل الثريد علي سائر الطعام). چاکی عائیشە لەسەر ژنان وەك چاکی

گۆشت و نانە لەسەر هەموو خواردەمەنیەك.

- **٣٠٩- پاداشتی ڕۆژوو: دەگێڕنەوە:** لە ئەبو سەعیدی خودری گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە، کەسێك ڕۆژێك لە ڕێی خوادا بەڕۆژوو بێ. خودا حەفتا ساڵ لە ئاگری دۆزەخ دووری دەکاتەوە.
- **٣١٠- شاردنەوەی تاوان: دەگێڕنەوە:** لە (داودی تائی) تێکەڵی خەڵك نەدەبوو. پرسیاریان لێکرد لەبەر چی تێکەڵی خەڵك نابیت؟ گوتی: چ لە گەلێك بکەم کە تاوانی خۆیان لەمن بشارنەوە؟
- **٣١١- عیسا لە نەفام فێرە ئەدەب بووە: دەگێڕنەوە:** بە عیسا پێغەمبەریان گوت: تۆ لەکێ فێرە ئەدەب بوویت ؟ گوتی: لە بێئەدەبان.
- **٣١٢- پێشەوا عومەر و حوزەیفە: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عومەر بەزاری خۆی بە حوزەیفەی دەگوت: ئایا هیچ ڕەوشتێکی دوو ڕوویم تیادا دەبینی؟
- **٣١٣- هۆی شەو نوێژ نەکردن: دەگێڕنەوە:** لە یەکێك لە پیاو چاکان، کابرایەك گوتی قوربان من بۆچی شەو نوێژم پێ ناکرێ، گوتی: دیارە بەڕۆژ تاوان دەکەیت.
- **٣١٤- سۆفیانی سەوری و شەو نوێژ: دەگێڕنەوە:** لە سۆفیانی سەوری دەڵێت: ماوەی مانگێ شەو نوێژم پێ نەکرا، چونکە تاوانێکم کردبوو!.
- **٣١٥- شەوە پیرۆزەکان: دەگێڕنەوە:** جەژنی قوربان و ڕەمەزان و لەیلە تولقەدر و عەرەفە و نیوەی شەعبان پیرۆزن.
- **٣١٦- ئامۆژگاری پێشەوا عومەر:** دەگێڕنەوە پێشەوا عومەر فەرموویەتی: نەکەن دۆستایەتی ئەحمەق بکەن، چونکە دەیەوێت سوودت پێبگەیەنێت. کەچی زەرەرت لێدەدا.
- **٣١٧- سەرۆکی گزیکار: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك لەکاربەدەستایەتیەکەی گزیکاری بکات خودا بەهەشتی لەسەر نارەوا دەکات. (ب.م).
- **٣١٨- ئەبوبەکر و جێنشینی: دەگێڕنەوە** کاتێ ئەبوبەکر بوو بە جێنشین گوتی: من لەئێوە چاکتر نیم. ئەگەر چاکەم کرد هاوکاریم بکەن. ئەگەر خراپەشم کرد قەدەغەم بکەن.
- **٣١٩- ئامۆژگاری پێشەوا عەلی: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عەلی گوتی: ئەگەر یەکێك

دەوڵەمەندێتی بیٚ سامانی دەویٚ . یا بەبیٚ هۆزی دەویٚ. باخودا بناسیٚ و خراپە نەکات.

- **٣٢٠- سیٚ تاوانی خراپ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سیٚ کەس ناچنە بەهەشت و خودا بە چاوی بەخشندە گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات. پیرەمێردی داوێن پیس و پاشای درۆزن و هەژاری لووت بەرز.
- **٣٢١- پەروەردگار ببوٚشە: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵلای پێشەوا عومەر پێغەمبەر (ﷺ) لە هەندیٚ کۆڕ ١٠٠ جار دەیگوت: رب اغفر لي وتب علي انك انت التواب الرحيم.
- **٣٢٢- غەزای گەورە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) جارێك بەخێر هاتنەوەی لە یارەکانی کرد، کە لەغەزا هاتنەوە، فەرمووی لە غەزای بچوك هاتنەوە بۆ غەزای گەورە . ئەوانیش گوتیان بۆ غەزا هەیە لە جەنگ گەورەتر بیٚ ؟ فەرمووی: بەڵیٚ غەزا لەگەڵ دەروونی خۆتان. (البیهقی).
- **٣٢٣- نەترسان لەکاربەدەست: دەگێڕنەوە** جارێك کۆمەڵێك پیاو بە عەبدوڵلای عومەریان گوت: ئێمە ئەو قسانەی لەپاش ملە بەرامبەر پاشایان دەیلێین، لەبەروە ڕوویان ناوێرین؟ گوتی ئێمە ئەم کارەمان لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە نیفاق دادەنا!.
- **٣٢٤- شێوازی سامان:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: مەردووم هەر دەڵیٚ: سامانم، کەچی ئەوەی خواردی رۆیشت، ئەوەی بە پۆشینەی دا دڕا. تەنها ئەوەی کردیە خێر ماوە. (م).
- **٣٢٥- درۆی دەوڵەمەندی بێباوەڕ: دەگێڕنەوە:** لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، یەکێك لە دەوڵەمەندان بەناوی عیینە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەو دەم سەلمانی فارسی لەتەك پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو. بەرگێکی خوری لەبەردابوو. دەوڵەمەندەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر کۆڕێکی سەربەخۆمان بۆ دابنێی باوەڕت پێدەکەین. ئێمە ئێستا بۆیە باوەڕ بەتۆ ناکەین، چونکە ئەمانە واتا هەژارەکان بۆنیان ناخۆشە، ئینجا خودای گەورە فەرمووی من نارازیم کە لە هەژاران دوور بکەویتەوە.
- **٣٢٦- پێغەمبەر و (ﷺ) شوکرانەی خودا: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) پاژنەی پێی ئاوسا بوو لەبەر زۆر نوێژ کردن. جا عائیشە گوتی: ئەی خودا لە تاوانەکانت خۆش نەبووە؟

بۆچی ئەوەندە خۆت ئازار دەدەی ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی شوکرانەی خودا نەکەم.

- ٣٢٧- **دەوری زمان لە جەستەدا: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: باوەڕی مرۆڤ راست نابێ تا دڵی راست نەبێ. دڵیش راست نابێ تا زمانی راست نەبێ.
- ٣٢٨- **پێشەوا عومەر و ئەبوبەکر: دەگێڕنەوە** جارێك پێشەوا عومەر پێشەوائەبوبەکری دیت وازمانی ڕادەکێشێ، گوتی ئەوە بۆ وادەکەی ؟ ئەبوبەکر وتی: ئەوەیەکە بم باتە دۆزەخ.
- ٣٢٩- **شێخ حەسەنی بەسری و زمان: دەگێڕنەوە:** شێخ حەسەنی بەسری فەرموویەتی: ئەوەی زمانی نەبەستێتەوە پارێزگاری نەکا. ئایینەکەی نەبەستراوە.
- ٣٣٠- **پیاو چاکێك و زمان: دەگێڕنەوە:** لە محەمەدی واسع فەرموویەتی: پاراستنی زمان لەلای من ناخۆشترە، لە پاراستنی پارە و پوول.
- ٣٣١- **تاوس و زمان: دەگێڕنەوە:** تاوس فەرموویەتی زمان وەك درندەیە. ئەگەربەرەڵلای بکەم دەمخوات.
- ٣٣٢- **دڵ شوشتن: دەگێڕنەوە:** خودای گەورە پەیامی بۆ ئیبراهیم ڕەوانە کرد فەرمووی: دڵت بشۆ، ئەویش گوتی: ئەی خودایە دڵ چۆن دەشۆردرێ، خودا فەرمووی: بەهۆی خەم و پەژارە لەسەر ئەو شتانەی لە دەستت چووە و لە دەستت دەچێت.
- ٣٣٣- **ترسی عومرانی حەسین لە خودا:** دەگێڕنەوە عومرانی حسین دەیگوت: بەخودا پێم خۆشە ببم بە خۆڵ و بکەومە ناو با.
- ٣٣٤- **شێخ حەسەنی بەسری و مەرگ: دەگێڕنەوە** جارێك شێخ حەسەنی بەسری چەند جارێك ئەو ئایەتەی دووبارە دەکردەوە (کل نفس ذائقة الموت)، دەنگێك هات گوتی: کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوار چوار هەزار جن دووبارەیان دەکردەوە. سەریان بۆ لای ئاسمان بەرز نەدەکردەوە. تاکو هەموویان مردن.
- ٣٣٥- **ئایین سەیری بالا ناکات: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەیەکی قوڵەڕەشی لووت بڕاو کرا گەورەتان. ئێوەی بە قورئانی پیرۆز بەڕێوە دەبرد،

تا کار بە قورئان بکەن، لە قسەی دەرنەچن.(م).

- **٣٣٦ - راسپاردەی سەعد بۆ کوڕەکەی: دەگێڕنەوە:** سەعدی وەقاس بە کوڕەکەی گوت: ئەی ڕۆڵە ئەگەر دەتەوێ دەوڵەمەند بی، قەناعەتت هەبێ، چونکە هیچ کەسێك بە ماڵ دەوڵەمەند نابێ . بەڵکو بە قەناعەت.
- **٣٣٧- شاردنەوەی دوو مردوو لە گۆڕێك: دەگێڕنەوە** لە جەنگی ئوحود ئەنسارەکان هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتیان بریندار و مردوومان زۆرە، چی بکەین ؟ پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: گۆڕی فراوان هەڵقەنن هەر گۆڕەو دوو مردووی بخەنە ناو. یان سێ، گوتیان کامەیان لە پێشەوە بێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی قورئانی پتر بزانێ.
- **٣٣٨- نوێژ و دەست نوێژ: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: نوێژ بەبێ دەست نوێژ نابێ و دەست نوێژیش بەبێ (بسم الله الرحمن الرحيم) نابێ.
- **٣٣٩- دوو تاوانی خراپ: دەگێڕنەوە** لە پێشەوا عەلی لە پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاستی سەختترین شت کە ترسم هەبێ لێیان بۆ ئێوە دوو شتە: بەدواکەوتنی هەوا و ئارەزوو. ئەمەل درێژی.
- **٣٤٠- جیهان هی ئەوە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی کەسێك بەیانی کردەوە لەش ساغ بوو . ئاسایش بوو . نانی ئەو ڕۆژی هەبوو. هەموو جیهان هی ئەوە.
- **٣٤١- شێخ حەسەن بەسری و قوتابییەکانی: دەگێڕنەوە** جارێك شێخ حەسەنی بەسری بە قوتابیەکانی گوت: مینبەر وتار خوێندنەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەگریا، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) مینبەرێکی تری بۆ دروست کرا. ئایا ئێوە بە مینبەرکەش و تێ نابێ.
- **٣٤٢- چاکی حوزەیفە : دەگێڕنەوە:** هەموو جارێ کە کەسێك دەمرد . پێشەوا عومەر پرسیاری لە حوزەیفە دەکرد، کە ئەگەر هاتبوایە سەر تەرمەکە، ئەوا نوێژی لەسەر دەکرد: ئەگینا لێی دەگەڕا.
- **٣٤٣- پێنج شت لە پێش پێنج شت: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) گەنجی لەپێش پیری و تەندروستی لەپێش نەخۆشی و دەوڵەمەندی لە پێش هەژاری و کات بەدەستەوە بوون لەپێش کات بەدەستەوە نەبوون و مان لە پێش مەرگ. غەنیمەتە.

- **٣٤٤- ئەنجامی رژدی: دەگێڕنەوە** پیاوێ لە بیابانێ یەك تاقە کولێرەی لا بوو دڵی نەدەهات بیخوات . چونکە لەدڵی خۆی دەیگوت لەپاش ئەمە کولێرە چۆن پەیدا بکەم. تا ماوەیەك هەر نەیخوارد. خودا یەکسەر عیزرائیلی نارده لای گیانی بکێشێ.
- **٣٤٥- زمان چوار دەرگەی لە پێشە: دەگێڕنەوە** لە عەلی کوڕی بەکار، فەرموویەتی هەموو شتێ دوو دەرگەی لەپێشە، بەلام زمان چوار دەرگەی لەپێشە. جووتە لێو و ددان
- **٣٤٦- پێغەمبەر و (ﷺ) پاشایان: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) نامەی بۆ پاشایەکانی سەردەمی خۆی رەوانە کرد. پاشا نەجاشی موسوڵمان بوو. قەیسەر موسوڵمان بوو. بەلام لەترسی گەلەکەی، خۆی ئاشکرا نەکرد . مقەوقەس وەلامی جوان بوو. کیسرا نامەی پێغەمبەری (ﷺ) دڕاند. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خودا تەفر و تونای بکات. ئەوە بوو شێرەوەی کوڕی کوشتی.
- **٣٤٧- پارە و خانوو بۆ خۆتان: دەگێڕنەوە:** عەبدوڵلای عامر خانوی لە خالیدی عوقبە کڕی . خانوەکە لەنێو بازار بوو. لەپاش مامەڵە برینەوە منداڵی خالد گریان عبداللە گوتی: بۆ دەگرێن،گوتیان لەبەر خانوەکە گوتی: پارەو خانوو بۆ خۆتان!.
- **٣٤٨- چاکێتی عەبدوڵلای مەسعود: دەگێڕنەوە** جارێك عەبدوڵلای مەسعود بۆ بازاڕ دەچوو. پیاوێك پارەکەی لێدزی. خەڵك گوتیان ئەم پیاوە دزی کردوە، عەبدوڵلا گوتی: وس بن لێی گەڕێن. ئەی خودایە ئەگەر ئەو پیاوە لەبەر نەبوونی دزی کردووە خێری لێ ببینی. ئەگینا ببێتە دوا تاوانی لە ژیانیدا.
- **٣٤٩- چاکێتی داودی تائی- دەگێڕنەوە** داودی تائی ئەوەندە لەخودای پەروەردگار دەترسا. شەوێك قورئانی دەخوێند. تووشی ئایەتێ بوو باسی ئاگری دۆزەخی دەکرد.تا بەیانی ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە.کە رۆژ هەلات مەرگی خودای بەجێ هێنا.!!!
- **٣٥٠- کەراماتی ئەسیدی حەزیر: دەگێڕنەوە** شەوێك لە شەوان ئەسیدی حەزیر و عەبادی بشر بۆ کاری پێویست. تا نیوەی شەو . لەلای پێغەمبەر (ﷺ) مانەوە .کە چوونە ماڵ هەریەکە و دارێکیان لەدەست دا بوو، دارەکان یەکەو چرایان پێوە لکا. تا گەیشتنە ماڵ پێشیان رەوشەن بۆوە. (ب).

- **٣٥١- ئازایەتی پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) بە مامەی خۆی گوت ئەگەر خۆر لە دەستی ڕاستەم دابنێن، مانگیش لە دەستە چەپ. من واز لەم ئایینە ناهێنم.
- **٣٥٢- بوومە لەرزە: دەگێڕنەوە** لەسەردەمی پێشەوا عومەر عەرد لەرزی. ئەویش گوتی: ئەی خەڵکینە ئەوە چیە ؟ دیارە شتێکتان کردووە. ئەگەر دووبارە بێتەوە لەناوتان دانانیشم.
- **٣٥٣- سوودی چاکە: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵڵای عەباس پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چاکە ڕوو جوان دەکا. دڵ ڕووناك دەکا. ڕۆزی زۆر دەکا. جەستە بەهێز دەکا. خۆشەویستی لەدڵی جەماوەر دروست دەکات.
- **٣٥٤- هۆی شت لەبەر نەکردن:** جارێکیان پێشەوا شافیعی بە وەکیعی مامۆستای گوت، هۆی شت لەبەر نەکردن چیيە ؟ گوتی: واز نەهێنانە لە تاوان.
- **٣٥٥- جەعفەری تالیب و نەجاشی: دەگێڕنەوە** کاتێ جەعفەری تالیب لەگەڵ هەندێ هاوەڵ چوونە لای نەجاشی پاشای حەبەشە. گوتیان ئێمە بتمان دەپەرست، مردارەوە بومان دەخوارد. دامەن پیسیمان دەکرد. سەردانی خزمانمان نەدەکرد. لەگەڵ هاوسێ خراپ بووین. ستەممان دەکرد. ئێستا پێغەمبەرێکمان بۆ هاتووە قەدەغەمان دەکا لەم ڕەوشتانە، بۆچی بەدوای نەکەوین؟. چونکە ئەمانە ڕاست و جوانن؟
- **٣٥٦- چۆن بوویتە گەورەی هۆزەکەت: دەگێڕنەوە:** معاویە بە عەرابەی گوت: چۆن بوویە گەورەی هۆزەکەت؟ گوتی بەرامبەر نەفامان نەرم بووم. بەرامبەر بەرپرسیار دەم بەخشی. جا هەر کەسێ ئاوا بێ وەك منە. ئەگەر چاکتر بوو ئەوا چاکترە. ئەگینا من چاکترم.
- **٣٥٧- کلیلی هەموو شتێ: دەگێڕنەوە:** لە جەعفەری محەمەد، کلیلی هەموو شتێ تووڕە نەبوونە.
- **٣٥٨- ئەموستیلەی پێشەوا عومەر: دەگێڕنەوە** ئەموستیلەی پێشەوا عومەر لێی نووسرابوو، مردن چاکترین ئامۆژگارە.
- **٣٥٩- پێشەوا عەلی و مەرگ: دەگێڕنەوە** پێشەوا عەلی جارێ لەناو مزگەوت دەیگوت: ئای مەرگ، زەخیرەی کەم، ڕێگەی درێژ.!!

- **٣٦٠- ئەعمەش و گۆڕ: دەگێڕنەوە** جارێ ئەعمەش خۆی لەنێو گۆڕی نا گوتی: ئای لەو جێیە تەسکە. ئای لەو تەنهاییە.
- **٣٦١- ئامۆژگاری سۆفیانی سەوری: دەگێڕنەوە** سۆفیانی سەوری فەرموویەتی سەرەتای خودا پەرستی کڕییە. ئینجا زانست. لە پاشاندا کارپێکردنی، لە پاشاندا بلاوکردنەوەی.
- **٣٦٢- مانەوە لە نوێژگا: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کاتی یەکێك لەئێوە نوێژ دەکا، لە پاش نوێژەکە فریشتە نزای بۆ دەکا و دەڵێ خودایە لێی خۆشبە و رەحمی پێبکە تا لەجێی نوێژەکەی هەڵدەستێ. یا بێدەست نوێژ دەبێ.
- **٣٦٣- کێت خۆش بوێ حەشرت لەگەڵ ئەوە: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کێت خۆش بوێ حەشرت لەگەڵ ئەوە) ئەنەس لەخۆشیان دەیگوت پێغەمبەر و پێشەوا ئەبوبەکر و عومەرم خۆش دەوێ!
- **٣٦٤- چاکێی عەبدوڵلای عەباس:** دەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی لە باوەشی ناو فەرمووی، خودایە فێرە تەفسیری قورئانی بکەی !
- **٣٦٥- مرۆڤ و گۆڕ: دەگێڕنەوە** کاتێ مردوو دەشارنەوە فریشتە دەڵێ: ئەوە هاتیتەوە بە تەنها . ماڵ و منداڵی دەگەڕێنەوە. تەنها کردەوەی لەوێ دەمێنێ.
- **٣٦٦- ئامۆژگاری پێشەوا عومەر: دەگێڕنەوە** لە پێشەوا عومەر دەیگوت لەگەڵ تەوبە کاران دابنیشین چونکە ئەوان دڵیان لە هەموو کەس نەرمترە.
- **٣٦٧- ئامۆژگاری شێخ حەسەنی بەسری دەگێڕنەوە شێخ حەسەنی بەسری دەیگوت:** کەسێك بەجیهان دڵ خۆش بێ. دوا رۆژی لەبیر دەچێ ئەگەر بەدوای زانیاری بکەوێ و پاشان دونیای بوێ. لە خودا دوور دەکەوێتەوە.
- **٣٦٨- خێرکەر و نەکەر: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەموو بەیانییەك دوو فریشتەی خودا دادەبەزنە سەر زەوی. یەکێکیان دەڵێ، خودایە ئەوەی خێر کارە بۆی زۆر بکەی. ئەوەی تر دەڵێ: خودایە ئەوەی خێر نەکەرە لێی ببڕی. (ب. م).
- **٣٦٩- هۆزە پاشگەزەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە** لە زانایانی ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەر سێ هۆز پاشگەزبوونەوە.یەکەم (بە نومدلج) سەرەك هۆزەکەیان ناوی

(زول خمار) بوو پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك لە پێش مەرگی خۆی هەواڵی مردنی بە هاوەڵان ڕاگەیاند. دووهەم بەنو حەنیفە سەرەك هۆزەکەیان موسەیلەمەی کەزاب بوو، کە جەنگی لەگەڵ ئەبوبەکر کرد سێهەم تەلحەی خوەیلد. کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد. دوایی شکستی لەجەنگی شام، لەگەڵ ئەبوبەکری خالیدی وەلید موسوڵمان بوو.

- ٢٧٠- **چاکی عەبدوڵلای عومەر: دەگێڕنەوە:** هەر کاتی گوێی لە ناوی پێغەمبەر (ﷺ) بوایە، چاوەکانی پڕ ئاو دەبوو.
- ٢٧١- **پێنج نزای گیرا: دەگێڕنەوە:** لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نزای ڕۆژوگر، پێشەوای چاك و زۆر لێ کراو و ڕێبوار و باوك بۆ منداڵی گەڕانەوەی نییە.
- ٢٧٢- **نزای بە کۆمەڵ: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر کۆمەڵە کەسێك نزا بکەن و کۆمەڵێکیش لەدوایان ئامین بکەن. ئەوا خودا نزایان گیرا دەکات.
- ٢٧٣- **کوشتنی باشترین کەس و خراپترین کەس: دەگێڕنەوە** لە وەحشی گوتی من کە کافر بووم پێشەوا هەمزەم کوشت. بەلام ئێستا کە موسوڵمان بووم موسەیلەی کەزابم کوشت!!!
- ٢٧٤- **پێغەمبەر و (ﷺ) کەڵەشێر: دەگێڕنەوە** جارێ کەڵەشێرێ نەخۆش کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لە دەوری دەسوڕایەوە بۆ چارەسەری وەکو پزیشك!.
- ٢٧٥- **پێغەمبەر و (ﷺ) منداڵی ساوا: دەگێڕنەوە** جارێ لە سوژدە، حەسەنی پێشەوا عەلی چووە سەر ملی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ یاری، پێغەمبەریش (ﷺ) سەری لە سوژدە بەرزنەکردەوە، تالاچوو کە نوێژەکە تەواو بوو، یاران گوتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە چی ڕووی دا، سوژدەت ئەوەندە درێژ بوو؟ گوتی ئێوە نەتان دی ئەو منداڵە لەسەر ملم بوو، دڵم نەهات لەگەمەی بکەم.
- ٢٧٦- **ئامۆژگاری مەکحولی شامی: دەگێڕنەوە:** دەیگوت: بەڕاستی من زۆر شەرم دەکەم، یەکێك ستەمی لێ بکرێ و کەسێ نەبێ لەسەری بکاتەوە.
- ٢٧٧- **ڕووگرژی: دەگێڕنەوە:** یەکێك لە پیاوچاکان: دەڵێ ئەگەر خوا پەرستی ڕووگرژ دۆستایەتیم بکات لەگەڵ فاسقی ڕووخۆش فاسقەکەم لاباشترە لە ئەو.

- **٣٧٨- دوو رووییتی: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەدوا ڕۆژ خراپترین کەس دووڕووە. (ا. ب.م.)
- **٣٧٩- خۆشەویستی پێغەمبەر** (ﷺ) : **دەگێڕنەوە** لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ژنێ مێرد و برا و باوکی شەهید کرا، کاتێ ئەم هەواڵەی پێ گەیشت گوتی: توخوا پێغەمبەر (ﷺ) ماوە گوتیان بەڵێ: گوتی کەواتە چی ڕووی نەداوە!!
- **٣٨٠- ئامۆژگاری پێشەوا عەلی:** لەسەردەمی پێشەوا عەلی پرسیاریان لێ کرد، پێغەمبەرتان (ﷺ) چۆن خۆش دەویست؟ فەرمووی: لە سامان و منداڵ و دایك بگرە لە ئاوی سارديش.
- **٣٨١- ئامۆژگاری پێشەوا عەلی: دەگێڕنەوە** پێشەوا عەلی فەرموویەتی: سەختترین سەربازی خودا کێوە . ئەویش بە ئاسن کەرت دەبێ. ئاسنیش بە ئاگر. ئاگریش بە ئاو ئاویش بەبا. مرۆڤیش لەبا بەهێزترە. خۆشی لە مرۆڤ بەهێزترە. خەو لە خۆشی بەهێزترە، خەم لە هەموان بەهێزترە.
- **٣٨٢- پێشەوا عومەر و خێزانی: دەگێڕنەوە** پیاوی بەهەشتاوی. لەبەر ڕێك نەکەوتنی لەگەڵ خێزانەکەی بۆ ماڵی پێشەوا عومەر چوو ، کە تەماشای کرد وا خێزانی پێشەوا عومەریش وەك خێزانی ئەوە، ویستی بڕوا، پێشەوا عومەر گوتی مەڕۆ ژنان خواردن ئامادە دەکەن. منداڵ بەخێو دەکەن. جلك دەشۆن..... دەبێ لەگەڵیان نەرم بیت.
- **٣٨٣- نوح پێغەمبەر و جیهان: دەگێڕنەوە:** لەسەرە مەرگ بە نوح پێغەمبەریان گوت: چۆن ژیانت بردە سەری لەم دونیایە ؟ چونکە تۆ هەزار ساڵە دەژی ؟ گوتی: وەك: پیاوێ لە دەرگەیەك بێتە ژوور. لەئەوی تر بچێتە دەر.
- **٣٨٤- گوتی نا : دەگێڕنەوە:** بە پیاوێکیان گوت: دونیات چەند دەوێت ؟ گوتی زۆر گوتیان هیچت دەست کەوتووە؟ گوتی: نا . گوتیان ئەی ئەگەر نەت ویستبا . گوتی: ئەوکات هەرنا.
- **٣٨٥- تاوانی شمشێر چی یە : دەگێڕنەوە:** باوکێك مرد دوو کوڕی لەپاش بەجێ ما لەگەڵ شمشێرێك . شمشێرەکە هەر ڕۆژێ لەلای یەکیان بوو، یەکێکیان غەزای پێدەکرد. ئەویتریش

دزی. تاوانی شمشێر چییە؟

- **٣٨٦- موسڵمان بوونی پێشەوا عومەر: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عومەر شمشێری لەکالان دەرهێنا بوو. ویستی پێغەمبەر (ﷺ) بکوژی .لەرێگە تووشی نەعیمی عەبدوڵلاّ بوو گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی ؟ گوتی: محەمەد دەکوژم. گوتی برۆ جارێ سەیری فاتمەی خوشکت و سەعیدی زاوات بکە، ئینجا محەمەد بکوژە، ئەوانە هەمویان موسڵمان بوونە. کە چووە لایان سورەتی (طه) یان دەخوێند، شەپازلەیەکی لە فاتمەی خوشکی دا . لە پاشاندا خودا دڵی نەرم کرد، تەماشای سورەتی (طه)ی کرد موسڵمان بووا.
- **٣٨٧- چاکی جوبەیری مونعیم: دەگێڕنەوە:** جارێ جوبەیری مونعیم گوێی لەو ئایەتە بوو (ام خلقوا من غير شي ء ام هم الخالقون) راست موسوڵمان بوو. گوتی: دڵم بۆ ئیسلام فڕی.
- **٣٨٨- پێغەمبەر (ﷺ)- و ژنی بێگانە:** دەگێڕنەوە لە عائشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)دەڵێ: دەستی پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز بە دەستی ژنی بێگانە نەکەوتووە.
- **٣٨٩- نزای پاش نوێژی هەینی: دەگێڕنەوە:** لە عراکی کوڕی مالیك، کاتێ نوێژی هەینی دەکرد لە پێش دەرگەی مزگەوت ڕادەوەستا، ئەم نزایەی دەکرد. ئەی خودایە. وەڵامی بانگی تۆم دایەوە. نوێژە فەرزەکەی تۆم کرد. واپەرتەم لێ کرد، هەروەك خۆت فەرمانت کردووە ئینجا رۆزیم بدە.

- **٣٩٠- ئەگەر پشت بە خودا ببەستی: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵلاّی عومەر پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: ئەگەر پشت بەخودا ببەستن هەروەك باڵندە پشتی پێ دەبەستن، بەیانی بەسکی بەتاڵی دەچنە دەرەوە. ئێواران بەتێری دێنەوە.
- **٣٩١- جۆرەکانی ئارامیی: دەگێڕنەوە:** ئارامیی سێ بەشە یەکەم: ئارامی لەسەر خودا پەرستی دووهەم: ئارامیی لەسەر شتە نارەواکان. واتە دەستیان بۆ نەبەی، سێهەم ئارامیی لەکاتی نەمانی سامان و گیان.
- **٣٩٢- پێغەمبەرێکی خوداو ئارامیی: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: پێغەمبەرێکی

خودا نەتەوەکەی ڕوخسارییان بە خوێن هێنا. ئەویش خوێنەکەی دەسڕیەوە و دەیگوت: خودایە لە گەلەکەم خۆشبە ئەوان نەفامن.

- **٣٩٣- ئارامیی لەکاتی کوێری: دەگێڕنەوە:** لە ئەنەسی مالیك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر خودا چاوی بەندەیەکی کوێر کرد. ئەویش ڕەزامەند بوو. ئەوا پاداشتەکەی بەهەشت نەبێ چیتر نییە.
- **٣٩٤- چاکی عومەری عەبدولعەزیز: دەگێڕنەوە** عومەری عەبدولعەزیز نامەیەکی نوسی بۆکار بە دەستەکانی، گوتی: موسڵمانان ئاگادار بکەنەوە، هەر کەسێك کارێکی چاکمان پێ ڕابگەیەنێ لەبارەی بەرژەوەندی موسڵمانان (١٠٠) دیناری پێ دەدەین، واتا ئاماژە بکا بۆ کارێ نەمان کردبێ، وەك مزگەوت نەخۆشخانە . پرد لەهەر شوێنێ بێ.
- **٣٩٥- بێزبوونەوە لەخۆ: دەگێڕنەوە: پێغەمبەر** (ﷺ)فەرموویەتی: بێزتان لەخۆتان نەبێتەوە ؟ یاران گوتیان چۆن بێزمان لەخۆ دەبێتەوە ؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: وا دەبێ لەسەرتان پێویستە قسە بکەن قاف و دی، بەلام لە ترسان نایکەن، یاخودا لە دوا ڕۆژ پێتان دەڵێ بۆ قسە هەقەکەتان نەکرد . لەمن بترسابوان هەقتر بوو!!
- **٣٩٦- چارەی ڕق: دەگێڕنەوە پێغەمبەر** (ﷺ)فەرموویەتی ڕق و قین لە شەیتانەوەیە . شەیتان لە ئاگر دروست کراوە. ئاگر بەئاو دەکوژێتەوە. جا هەر کاتێ تووڕەبون دەست نوێژ بشۆن.

- **٣٩٧- ئامۆژگاری پێشەوا عەلی: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عەلی فەرموویەتی: ڕق و قین سەرەتای شێتیە. بنەتای پەشیمانییە.
- **٣٩٨- چوارشت گەنجینەی بەهەشتە: دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان چوارشت گەنجینەی بەهەشتە باس نەکردنی هەژاری، گرفت،ئیش، خێرکردن بەدزی..
- **٣٩٩- پێشەوا عومەر و نزاکەرێ: دەگێڕنەوە:** کابرایەك نزای دەکرد و دەیگوت: خودایە لە کەمەکانم بگێڕە. پێشەوا عومەر گوتی: مەبەستت چییە گوتی: خودا نەیفەرمووە. {وقليل من عبادي الشكور }

- **٤٠٠- هونراوەی خراپ: پێغەمبەر فەرموویەتی:** ئەگەر یەکێك لەئێوە سینەی پڕکا لەکێم و زوخاو چاکترە، نەك لەهۆنراوەی خراپ.
- **٤٠١- ئامۆژگاری ئەبوزەر- دەگێڕنەوە:** گوتی: تەنهایی لەکۆڕی پیاو خراپان چاکترە. کۆڕی پیاو چاکان لە تەنهایی چاکترە.
- **٤٠٢- دۆستی ڕاستەقینە: دەگێڕنەوە:** لە حوسێنی عەلی گوتی: ئایا یەکێك لە ئێوە دەتوانێ دەستی لە گیرفانی دۆستەکەی بنێ بەبێ پرسی گوتیان: نەء گوتی: کەواتە هێشتا نەبونەتە دۆست.
- **٤٠٣- دۆستایەتی مسروق و خوسیمە-: دەگێڕنەوە:** مسروق قەرزێکی زۆری لەسەر بوو. خوسیمە بەبێ ئاگاداری ئەو قەرزکەی بۆ دایەوە، کەچی خۆشی قەرزار بوو، مسروق بەبێ ئاگاداری ئەو قەردەکەی بۆ ئەو دایەوە.
- **٤٠٤- ئامۆژگاری ئەبو سلە یمانی الدارانی: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر جیهان هەمووی هی من بێ. هەمووی لەزاری دۆستێکم بکەم هێشتا کەمە.هەروەها گوتی: کاتێ دۆستێکم پاروو دەباتە زاری، تامی لە دەمی من دایە.
- **٤٠٥- ناسینی ناوی دۆست و کار و هۆزی: دەگێڕنەوە:** جارێ عەبدوڵڵای عومەر لە کۆڕی پێغەمبەر سەیری لای ڕاست و چەپی دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ ئەوە بۆ ؟ دەڵێ چاو لە دۆستێ دەگێڕم، بەڵام ناوم نەزانیوە. جا پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەگەر دۆستت گرت ناوی خۆی و باوکی و شوێن و کار و هۆزی بزانن.
- **٤٠٦- ئامۆژگاری عەبدوڵڵای مەسعود: دەگێڕنەوە** گوتی: ئەگەر پیاوێ هەفتا ساڵ لە نێوانی ڕوکن و مەقامی ئیبراهیم خودا پەرستی بکات، کێی خۆش بوێت حەشری لەگەڵ ئەوە.
- **٤٠٧- ئامۆژگاری فضل: دەگێڕنەوە:**گوتی: سەیر کردنی دۆست بەچاوی خۆشەویستی فضل خودا پەرستی یە.
- **٤٠٨- ببە دۆستی دوو کەس: دەگێڕنەوە:** لە زانایان، ببە دۆستی دوو کەس، پیاوێك لە ئایین لێت فێرە شتێ بێ، یا تۆ لێی فێر بیت.
- **٤٠٩- جۆرەکانی دۆست: دەگێڕنەوە:** چوار دۆست هەیە: یەکەم شیرینە لێی تێر مەبە.

دووهەم تاڵە مەیخۆ . سێهەم ترشە لە پێش ئەوەی بت خوات تۆ بیخۆ . چوارەم سوێرە لەکاتی پێویست بیخۆ.

- ٤١٠- **دۆستی پێنج کەس مەبە: دەگێڕنەوە:** لە جەعفەری صادق گوتی: دۆستی درۆزن مەبە فێلت لێ دەکات، دوورت لێ نزیك دەکات . نزیکیش دوور، دۆستی ئەحمەق مەبە دەیەوێ سوودت بداتێ بەلام زیانت لێ دەدا . دۆستی ڕۆژ مەبە بێ خێرە، دۆستی ترسەنۆك مەبە لەناوت دەبات . دۆستی فاسق مەبە دەتفرۆشی.
- ٤١١- **دا پۆشینی کەم و کوڕی:** دەگێڕنەوە: لە عیسا پێغەمبەر گوتی: ئەگەر دۆستێ خەوی لێ کەوتبوو، با جلەکەی لەسەر لابرد بوو چی لێ دەکەن ؟ گوتیان دای دەپۆشین . گوتی نەء گوتیان: چۆن ؟ گوتی: ئەی بۆ کاتێ ناوی دۆستێ لەلاتان دێت، ئێوەش بەزیادەوە کەم و کوڕیەکانی ئاشکرا دەکەن.
- ٤١٢- **مافی دۆستایەتی: دەگێڕنەوە:** لە پێشەوا عومەر گوتی: ماف دۆستایەتی سێ شتە. کاتێ پێی گەیشتی سلاوی لێ بکەیت ، لەنێو کۆڕ جێی بکەیت، بە جوانترین ناو بانگی بکەیت.
- ٤١٣- **دۆستی گیانی بە گیانی: دەگێڕنەوە:** لە (عەلی ئەلرباتی- گوتی: جارێ لەگەڵ عەبدوڵلای الرازی چوینە گەشت گوتی: کامەمان برا گەورە بێ ؟ گوتم تۆ، خواردنەکەی لە پشت بوو، ماوەیەك ڕۆیشتن گوتم برسیمە ؟ گوتی پەلە نەکەی، ئەی من برا گەورە نیم، شەوێ باران باری من دانیشتم. ئەویش ڕاوەستا بوو پەنای لێ کردم، نەی هێشت هەڵسمەوە لە خەیاڵی خۆم گوتم: خۆزگە دەمگوت من برا گەورەم.
- ٤١٤- **ئامۆژگاری سلف: دەگێڕنەوە:** گوتیان: دۆست ئەوەیە. ئەگەر هەژار بویت لێت نزیك بێ. ئەگەر دەوڵەمەند بووی چاوی لە سامانت نەبێ. ئەگەر پلەی بەرز بوو لووتی بەرز نەبێ.
- ٤١٥- **دیدەنی نەخۆش: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵلای عەباس گوتی: ئەگەر جارێ بچیە لای نەخۆش ئەوە سوننەتە. ئەگەر دووبارە و سێ بارەت کردەوە ئەوە خێرە.
- ٤١٦- **مالیکی دینار و مەرگ: دەگێڕنەوە:** گوتی: سوێندم بە خودا دڵم ئارام نابێتەوە تاکو

جێی خۆم دەزانم لەدوا ڕۆژ، جێی خۆشم نازانم، تا دەمرم.

- **٤١٧- هاوسێی ڕاستەقینە: دەگێڕنـەوە:** پیـاو چـاکێ مـشك لـە ماڵیـان هـەبوو. گوتیـان پشیلەیەك ڕابگرە . مشکەکان دەخوات: گوتی: دەترسم لە ترسی پشیلە مشك بچنە ماڵـە هاوسێکەم. ئەگەر پێم خۆشبـێ، نیشانەی ئەوەیە . باوەڕم ناتەواوە.
- **٤١٨- ژمارەی هاوسێ: دەگێڕنـەوە:** پیـاوێ هاتـە لای پێغەمبـەر (ﷺ) سـکاڵای هاوسـێی خراپی کرد. پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکی بانگ کرد گوتی: بـڕۆ لـەنێو مـاڵان بگـەڕێ و بـە دەنگی بەرز بڵێ، چل ماڵ لەلای ڕاست و چەپ و پاش و پێش هاوسێنە.
- **٤١٩- خۆت نزات لێ کردوە: دەگێڕنەوە:** لە (عەبدوڵڵای مبارك) پیـاوێ هاتـە لای گـوتی: کوڕەکەم لەگەڵم خراپە ؟ گوتی: چ جـارێ نـزات لـێ کـردووە ؟ گـوتی بـەڵێ: گـوتی کەواتە تاوان لە خۆتە.
- **٤٢٠- گیانمان وەك یەکە: دەگێڕنەوە** ئەبو هورەیرە جارێ پیاوێکی دی سواری ولاخ ببوو. بەندەکەی بە پیادە لە پشتی دەڕۆیشت ئـەبو هـورەیرە گـوتی: سـواری بکـە گیانتـان وەك یەکە.
- **٤٢١- گرنگێتی فەرمان بەچاکە: دەگێڕنەوە:** لە پێشەوا عەلی گوتی: زاڵ بوون لـە جیهـاد ئەوەیە: بە دەست و زمانو دڵ جیهاد بکەن، واتا فەرمان بە چاکە.
- **٤٢٢- مەلای بێ کردەوە :دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: لەو شـەوەی چـوومە ئاسمـان فەرمووی‌کۆمەڵە کەسێکم دیت لێویان بە مەقەسی ئاگر قوت دەکرا، گوتم ئەوانـە کـێن ؟ گوتیان فەرمانیان بە چاکە دەکرد و خۆیان کاریان پێ نەدەکرد.
- **٤٢٣- خۆت چاك بکە: دەگێڕنەوە:** خودا بە عیـسا پێغەمبـەری گـوت چـاکە بکـە. ئەگـەر ئامۆژگاریەکانت بۆ خۆت سودی هەبوو، ئینجا خەڵکەکە ئامۆژگاری بکە، ئـەگینا شـەرم لەمن بکە.
- **٤٢٤- سوودی لێ خۆشبوون : دەگێڕنەوە:** لە عکرمە گوتی: خودا بە یوسفی یعقوبی فەرموو: ئەگەر لە برایەکانت خۆش نەبوای، ناوم بەرز نەدەکردی لەجیهان و دواڕۆژ.
- **٤٢٥- دەرگەکانی دۆزەخ: دەگێڕنەوە** لە عبادە صـامت گـوتی: سـێ دەرگـەی دۆزەخ، بـۆ

دەوڵەمەندی خراپە. سێ دەرگەش، بۆ ژنانی خراپە. دەرگەیەك بۆ هەژارانی خراپە.

- ٤٢٦- **کۆڕی مردوان**: **دەگێڕنەوە**: جارێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەکۆڕی مردووان دامەنیشن، گوتیان کۆڕی مردووان چی یە ؟ فەرمووی کۆڕی دەوڵەمەندان.
- ٤٢٧- **سلێمان پێغەمبەر**: **دەگێڕنەوە**: سلێمان پێغەمبەر هەموو جارێ کە هەژارێکی دەدیت، دەچوو لەلای دادەنیشت و دەیگوت: هەژارێ لەلای هەژارێ دانیشتووە.
- ٤٢٨- **ناخۆشی قیامەت**: **دەگێڕنەوە**: لە عەلی فضیل رۆژێ دەگریا گوتیان ئەوە بۆ ؟ گوتی: بیر لە ئەو کەسە دەکەمەوە کە ستەمی لەمن کردووە لە دوارۆژدا، دەبێ بەڵگەی چی بێ؟.
- ٤٢٩- **گۆڕیەکەم ماڵە**: **دەگێڕنەوە** لە (حاتم اصم) گوتی: کەسێك بەلای گۆڕستان تێپەڕی و بیرنەکاتەوە گزی لەخۆی و ئەوان کردووە.
- ٤٣٠- **سێ کاری چاك**: **دەگێڕنەوە**: کەسێك خودای خۆش بوێ و خودی بکەوێتە سەر قورئان و،مەرگ ئامۆژگاری بێ، بەسیەتی.
- ٤٣١- **تەنهایی**: **دەگێڕنەوە**: لە (حاتی اصم) جارێ پاشا چووە لای گوتی: حاتم چ کارێکت هەیە، گوتی پێم خۆشە نەم بینی . نەت بینم، نەم ناسی!
- ٤٣٢- **گۆرانی**: **دەگێڕنەوە**: لە پێشەوا شافعی گوتی: گۆرانی قسەیەکی خراپە و لە ناهەق دەچێت. ئەگەر خاوەنەکەی بەردەوام بێ بە شایەت ناچێ و بەبێ هۆش دادەنرێت.
- ٤٣٣- **مردووی زیندوو**: **دەگێڕنەوە**: حوزەیفە گوتی: کەسێك نکولی خراپە نەکات بە دەست و زمان و دڵی، ئەوە مردووێکی بەناو زیندووە.
- ٤٣٤- **ئیبراهیم پێغەمبەر و میوان**: **دەگێڕنەوە**: نانی بەبێ میوان نەدەخوارد، لە دەورووبەری شارەکەی دەگەڕا، تا میوانێ بدۆزیتەوە رۆژ هەبوو ٣ میوانی هەبوو، یا دە میوان تا سەد میوان نازناوی (باوکی میوانانە) چونکە میوانخانەی هەبوو.
- ٤٣٥- **نەچوونە سەر داوەت**: **دەگێڕنەوە**: لە ئەبو نزابی ئەلەنخەشی گوتی: جارێك برادەرێ شیوی بۆ کردم و نەچووم چوارده رۆژ برسیم بوو، زانیم سزای نەچوونمە کە خودا سزای داوم.

- **٤٣٦- ئامۆژگاری مەعروفی کەرخی: دەگێڕنەوە** دەیگوت: هەر کەسێك بانگم بکات من دەچم. من میوانی هەموو کەسێك دەبم.
- **٤٣٧- چوونە سەر داوەت: دەگێڕنەوە:** لە تەورات یا لە هەندێ نامەی خودا نوسراوە . میلێ برۆ بۆ سەردانی نەخۆش. دوو میل برۆ بۆ سەردانی دۆست.
- **٤٣٨- پێغەمبەر (ﷺ) و میوان: دەگێڕنەوە:** لە قتادە جارێ وەفدی نەجاشی هاتە میوانداری پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر بەخۆی خزمەتی دەکردن. یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە خزمەتیان دەکەین.پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوان لەگەڵ هاوەڵانی من زۆر چاك بوون . بۆیە چاکەکەیان دەدەمەوە.
- **٤٣٩- خواردنی ماڵی دۆستان:** دەگێڕنەوە جارێ حەسەنی بەصری لەناو بازێر، خواردنی لەدوکانی برادەرێکی دەخوارد. برادەرەکەی لەوێ نەبوو. پیاوێ گوتی: ئەی حەسەن چۆن بەبێ پرسی دوکاندار ئەو هەنجیر و خواردنانە دەخۆیت ؟ گوتی: ئایەتی خواردن بخوێنەوە تا گەیشتە (او صدیقکم) واتا یا خواردنی ماڵی دۆستان، کابرا گوتی: ڕاست دەکەی نەمزانی دروستە.
- **٤٤٠- پێشەوا عەلی و میوانداری: دەگێڕنەوە:** جارێ کابرایەك پشەوا عەلی بردەوە ماڵێ عەلی فەرمووی: بەسێ مەرج دەبمە میوانت. شت لەبازێر نەکری بۆ من. ئەوەی لە ماڵە نەیشاریەوە. بەشی منداڵەکانیشت بدەی.
- **٤٤١- برادەری چاك: دەگێڕنەوە:** لە هەندێ تابیعی جارێ میوانی هات هیچیان نەبوو، چووە ماڵی برادەرێکی. مەنجەڵێك لەسەر ئاگر بوو، مەنجەڵە شیوەکە و هەندێ نانی هێنا، لەپێش میوانەکانی دانا. کە خاوەن ماڵەکە هاتەوە گوتیان: فلانی برادەرت مەنجەڵە شیوەکەی برد، گوتی کارێکی چاکی کردووە!.
- **٤٤٢- ئەدەب لەگەڵ میوان: دەگێڕنەوە:** لە ثوری گوتی: ئەگەر میوانت هات، نەڵێ ی دەخۆیت بۆت بهێنم ؟ خواردنی لەپێش دابنێ، ئەگەر خواردی یان نەیخوارد!
- **٤٤٣- ڕێزگرتنی میوان: دەگێڕنەوە:** جارێ معاویە بووە میووانی هاروونە ڕەشیدی پادشای عێراق. پیاوێکی کوێر بوو. هاروونە ڕەشید ئاوی بەدەستی داکرد. کە دەستی شۆرد هارون

گوتی: ئەوە کێ بوو ئاوی بە دەست داکردی ؟ گوتی نازانم . هاروون گوتی من بوم. معاویە گوتی رێزی زانستت گرتوە. خودا رێزت بگرێت.

• ٤٤٤- **گرنگێتی میوان: دەگێڕنەوە:** لە حەسەنی بەصری گوتی: خێرێ بۆخۆتت و خێزانت خەرج بکەی لە خواردن، لێ پرسینەوەی لەسەرە. جگە لە خەرجکردن بۆ میوان، چونکە خودا شەرم دەکات لەسەر ئەوە پرسیارت لێ بکات.

• ٤٤٥- **گرنگێتی شیو کردن:** دەگێڕنەوە: لە پێشەوا عەلی گوتی: ئەگەر کۆمەڵە برادەرێکم داوەت بکەم. لام چاکترە لە ئازاد کردنی بەندەیەك.

• ٤٤٦- **شیوکردن بۆ برسیان: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خودا لە رۆژی دوایی بە بەندەی دەڵێ برسیم بوو نانت نەدام. ئەویش دەڵێ خودایە تۆ برسیت نابێ ؟خودا دەڵێ: ئەی بەندەی من برسی نەبوو؟. تێرت نەکرد!.

• ٤٤٧- **وەرعی پیاو چاکان: دەگێڕنەوە:** زەنونی مصری لە بەندیخانە دەبێ. خوشکێکی دۆستی خواردنی بۆ رەوانە دەکات. ئەویش نایخوات. دەڵێ بە دەستی دەرگەوانی بەندیخانە بۆم هاتووە. ئەوانە پیاوی خراپن.

• ٤٤٨- **گەورێتی یادی خودا:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هیچ کارێ وەك یادی خودا نییە بۆ رزگار بوون لە سزای خودا. یاران گوتیان جیهادیش. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی . جیهادیش جگە لە ئەو جیهادەی کە کابرا شەهید بێ و زیندوو بێتەوە، سێ جار شەهید بکرێ!

• ٤٤٩- **داود پێغەمبەر و یادی خودا: دەگێڕنەوە:** دەیگوت: خودایە ئەگەر بەلای کۆرێ تێپەڕیم کە یادی تۆیان دەکرد، جێم هێشتن، چوومە کۆڕی بێ ئاگایان قاچم بشکێنە.

• ٤٥٠- **ئەبو هورەیرە و یادی خودا: دەگێڕنەوە:** دەیگوت: هەروەك خەڵکی سەر زەوی ئەستێرەکانی ئاسمانیان لێ دیارە لە شەواندا. خەڵکی ئاسمانیش ئەو ماڵانەیان بۆ دەبێتە ئەستێرە کە یادی خودا دەکەن.

• ٤٥١- **سۆفیانی عیینە و یادی خودا: دەگێڕنەوە:** دەیگوت کاتێ کۆمەڵە کەسێك کۆدەبنەوە بۆ یادی خودا. شەیتان و جیهان دەرۆن دوور دەکەونەوە. شەیتان دەڵێت:

جیهان ئاگات لێیە. جیهان دەڵێ لە پاش کەمێك کە زکرەکە تەواو بوو پشتی ملیان دەگرم و دەیان هێنمە بەر دەستت.

- ٤٥٢- **یادی خودا میراتە: دەگێڕنەوە:** جارێ ئەبو هورەیرە چووە باژێر و گوتی: خەڵکینە: میراتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوت بەش دەکرێ، خەڵکەکەش چوونە مزگەوت هیچیان نەدی .تەنها هەندێ کەس یادی خودایان دەکرد و قورئانیان دەخوێند گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە میراتی پێغەمبەر (ﷺ) نییە ؟ گوتی: مەبەستم یادی خودا بوو!.
- ٤٥٣- **گەورەترین پاداشت: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو هورەیرەی گوت: هەموو کارێك لە ڕۆژی دوایی لەنێو تەرازووی خودا دادەنرێت و دەکێشرێ. جگە لە (لا الە الا اللە- چونکە(لا الە الا اللە) ئەگەر لە بەرامبەرهەفت چینی ئاسمانو زەوی دابندرێ گرانوسەنگینترە.(ابن حبان.الحاکم صحیح).
- ٤٥٤: **یادی (سبحان الله الحمد لله الله اکبر-: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کەسێك لە پاش هەموو نوێژێ سی و سێ جار سبحان الله و سی و سێ جار الحمد للە. سی و سێ جاریش اللە اکبر. لە کۆتایی لا الە الا اللە بلێ. خودا لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێت، ئەگەر وەك کەفی دەریاش زۆر بن! (م).
- ٤٥٥- **ئامۆژگاری تەورات: دەگێڕنەوە:** نوسرا بوو لە تەورات، ئەی بەندەی من، چۆن شەرم ناکەی، کاتێ نامەی دۆستێکت پێدەگات، پیت بە پیت دەیخوێنیتەوە . ئەگەر لەلات بێ زۆر بە جوانی سەیری دەکەیت. بەڵام نامەی من لەبەر دەستت دایە کەچی پشتت لێی کردووە.
- ٤٥٦- **قورئان خوێندنی بە بێ گریان: دەگێڕنەوە:** لە ساڵحی مدی گوتی: جارێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتە خەونم و گوتی: ئەی ساڵح قورئان دەخوێنی. بەڵام گریانت نییە.
- ٤٥٧- **قورئان خوێندن بە دەنگ: دەگێڕنەوە:** لە سەعیدی مسیب جارێ عومەری عەبدولعەزیز لەناو نوێژێکی بە دەنگی بەرز دەیخوێند. سەعید کەسێکی ناردە نزیکی گوتی: پێی بلێ دەنگی نزم بکات. کابرا گوتی: مزگەوت بۆ هەموومان یەکە. سەعید بە دەنگی بەرز گوتی: ئەی نوێژگۆ دەنگت نزم بکە. ئەگەر لەبەر خەڵك وا دەکەی بێ سوودە.

ئەگەر لەبەر خوداش نوێژ دەکەی دەنگت نزم بکـە. عومـەر دەنگـی نـزم کـرد ئـەوکات پێشەوای ئیسلام بوو.

- **٤٥٨- شێوەی قورئان خوێندنی هاوەڵان: دەگێڕنـەوە:** ئەبوبـەکر قورئـانی بـە دەنگـی نـزم دەخوێند و عومەر بە دەنگی بەرز و بیلال بە هەردوو لا ئەبوبەکر گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خودا ئەوەی بۆی دەخوێنم گوێی لێیە. عومەر گوتی: پیاوی خراپ بێدار دەکەمەوە، بـیلال گوتی: پاك و پاك تێکەڵ دەکەم.
- **٤٥٩- قورئان هەموو شتێکی تیادایە: دەگێڕنەوە:** لـە عەبدوڵڵای مەسعود گـوتی: ئەگـەر دەتانەوێت زانست بزانن قورئان بخوێنن. چونکە زانستی سەرەتا و بنەتا لـە نێو قورئان دایـە. هەروەها فەرمووی: کەسێك قورئانی خۆشبوێت خودا و پێغەمبەری خۆش دەوێت. کەسێك ڕقی لـە قورئان بێت، ڕقی لـە خودا و پێغەمبەرە.
- **٤٦٠- قورئان چرایە: دەگێڕنەوە لە عەمرعاص گوتی:** هەر ئایەتێك لـە قورئان پلـەیەکە لـە بەهەشت و چرایە بۆ ماڵەکانتان. کەسێك قورئـان بخـوێنێ لەگـەڵ پێغەمبـەرانـە، ئەوەنـدەی جیایە کە پەیامی بۆ نەهاتووە.
- **٤٦١- ماڵێ بۆ قورئان خوێندن: دەگێڕنـەوە:** ئـەبو هـورەیرە گـوتی: ئـەو ماڵـەی قورئـان خوێندی تیادایە، فریشتەی خودا دێنە ئـەو ماڵـە و پـڕ خێـر و بێـر دەبێـت و شـەیتانەکان دەڕۆن. ئەو ماڵەی قورئان خوێندنی تیادا نییـە. خێـری نـابێ و شـەیتان دێتـە ئـەو ماڵـە و فریشتە دەڕوا.
- **٤٦٢- ئامۆژگاری سیفانی سەوری : دەگێڕنەوە:** گوتی: کـاتێ کەسـێك قورئـان دەخـوێنێ، فریشتە نێو چەوانی ماچ دەکات.

- **٤٦٣-ئامۆژگاری سلف: دەگێڕنەوە:** گوتیان کاتێ هەندێ قورئان خوێند، سورەتێ دەکەنەوە بۆ خوێندن، فریشتە نزایان بۆ دەکەن. بـۆ هەنـدێکیش نـەفرەت دەنێـرن، گوتیـان چـۆن ؟ گوتیان کەسێك ڕەوا بە ڕەوا بزانێ و ناڕەوا بە ناڕەوا، فریـشتە نـزا یـان بـۆ دەکـەن. بـە پێچەوانە نەفرەت دەکەن.

- **٤٦٤- گەورێتی فێر کردن: دەگێڕنەوە:** لە یحیی معاذ هیچ شتێ بە ئەندازەی کێو نیە. جگە لە خێر کردن. ئەگەر دەنکە دانەوێڵەیەکیش بێ، لەلای خودا دەبێتە کێوێك!.
- **٤٦٥- ئامۆژگاری عومەر و عەبدوڵلای کوڕی: دەگێڕنـەوە:** لـە پێشەوا عومـەر لەچـاکەدا شانازیان بەخۆیان کرد. خێر گوتی: مـن لـە هـەمووتان گـەورەترم . عەبـدوڵلای کـوڕی شەکری دەکردە خێر. دەیگوت لەبەر ئەوەی خۆم زۆرم ئارەزوو لە شەکرە.
- **٤٦٦- سوودی خێر بۆ دوا ڕۆژ: دەگێڕنەوە:** لە عبیدی عمیر. خەڵك لەدوا ڕۆژ زۆر برسـینە . تینونە. بێ بەرگن . جگە لە ئەوانـەی کـە لەبـەر خـودا ئاویـان بەخـشیوە و خۆراکیـان بەخشیوە. جلیان بەخشیوە.
- **٤٦٧- خێر کردنی پێشەوا ئەبو بەکر و عومـەر: دەگێڕنـەوە:** جـارێ ئەبوبـەکر و عومـەر خێریان کردبوو، پێغەمبەر (ﷺ)بەعومەری گوت: چیت بۆ ماڵت و خێزانت هێشتۆتەوە ؟ گـوتی:نیوەی،پێغەمبـەر(ﷺ)فـەرمووی: نێوانتـان وەك ئـەو دوو وتەیـە. (د. ت.الحـاکم صحیح).
- **٤٦٨- تەواو کردنی چاکە : دەگێڕنەوە:** چاکە بەسێ شت دەبێت. یەکەم پەلەی لێ بکەی، دووهەم بەکەمی دابنێی. سێهەم . بە دزی ئەنجامی بدەی.
- **٤٦٩- ئامۆژگاری عیسا بۆ خێرکەران: دەگێڕنەوە:** گوتی ئەگەر هەژارێ لەدەرگە بـدات و ماڵەکە بە بەتاڵی ڕەوانی بکەنەوە، ئەوە فریشتەی خودا. تا هەفت ڕۆژ نایەتە ئەو ماڵە.
- **٤٧٠- ئامۆژگاری عومەری عەبدولعەزیز بۆ خێرکاران: دەگێڕنەوە:** گـوتی: نوێـژ دەتانباتـە نیوەی ڕێگە. ڕۆژوو دەتانباتە دەرگا. خێر کردنیش دەتانباتە ژوور.
- **٤٧١- کۆلیێرە کردنە خێر: دەگێڕنەوە:** لە عەبدوڵلای مەسـعود پیـاوێ هـەفتا سـاڵ خـودا پەرستی کرد، لە پاشاندا زینای کرد. خودا ڕقی لێ گرت، ڕۆژێ تووشـی هـەژارێ بـوو، کولێرەیەکی پێدا، خودا بە ئەوە لێی خۆشبوو.
- **٤٧٢- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء : دەگێڕنەوە:** دەیگوت تەقوا ئەوەیە پیاو بە ئەنـدازەی یـەك تویسقال ترسی نەبێ لە خواردن و سامانی.
- **٤٧٣- ڕوونکردنەوەی شت: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ص) هـەموو جـارێ کـە دیاریـەکیان بـۆ

دەهێنا، پرسیاری دەکرد ئایا زەکاتە یا دیارییە ؟ تا ڕوونی دەکردەوە. چونکە خۆی زەکاتی وەرنەدەگرت.

- **٤٧٤-خواردنی شتی سەر ڕێگا: دەگێڕنەوە:** شەوێك پێغەمبەر (ﷺ) خەوی لێ نەدەکەوت، پرسیاریان لێ کرد؟ فەرمووی: دەنکە قەسپێکم هەڵگرتەوە و خواردم دەترسم قەسپی زەکات بوو بێ. (ا. اسناده جید).
- **٤٧٥- ئامۆژگاری بۆ پیاوی ناڕەوا خۆر: دەگێڕنەوە** لە سفیانی ثوری، شێوەی ئەو کەسەی کە خواردنی ناڕەوایە وەك ئەو کەسەیە کە جل و بەرگی پیس بە میز بشوات!.

**٤٧٦- سامانی بە شوبهە: دەگێڕنەوە:** لە (عەبدوڵلای مبارك) گوتی: ڕەت کردنەوەی درهەمێکی بە شوبهە پێم چاکترە لە کردنی خێری ١٠٠ هەزار درهەم.تا ٦٠٠ هەزار درهەم.

- **٤٧٧- ئامۆژگاری سلف بۆ پیاوی ڕەوا خۆر: دەگێڕنەوە:** دەیانگوت خۆراك ئەگەر ڕەوا بوو، لە یەکەم پاروو خودا لە خاوەنەکەی خۆش دەبێت. ئەگەر مرۆڤ بایەخ بە سامانی ڕەوا بدات. ئەوا خودا تاوانی ڕەش دەکاتەوە. هەروەك دار کاتێ بێ پەلك دەمێنێتەوە.
- **٤٧٨- ترسی عومەری عەبدولعەزیز لە ناڕەوا: دەگێڕنەوە:** جارێ میسك یان لەلاکێشا، ئەویش لووتی خۆی گرت و گوتی: با بۆنە کەی نێتە ناو لوتم چونکە سامانی گشتی موسلمانانە.
- **٤٧٩- ئامۆژگاری مالیکی دینار:** دەگێرنەوە: فەرموویەتی: وەرن با تەوبە لەگوناهێ بکەین، کەخەڵك لێی بێ ئاگان، ئەویش خۆشەویستی دنیایە.
- **٤٨٠- وەرعی تەواو:** دەگێڕنەوە: لە بشری حافی ئاوی لە جۆگان نەدەخواردەوە کە پاشایان دروستیان کردبوو. دەیگوت پارە و پولی ئەوان ناڕەوایە.
- **٤٨١- گرنگێتی کار: دەگێڕنەوە** عیسا پێغەمبەر (علیه السلام) پیاوێکی خودا پەرستی دیت گوتی: کێ بەخێوت دەکات ؟ گوتی برام. عیسا پێغەمبەر(علیه السلام) گوتی: براکەت لەتۆ چاکترە.
- **٤٨٢- ئامۆژگاری عومەر بۆ کرێکاران: دەگێڕنەوە:** دەیگوت زۆر پێم خۆشە لە ئەو کاتەی

دەمرم، لە نێو ئیش و کاردا بم.

- **٤٨٣- کار لە دەرۆزەت دەکات: دەگێڕنەوە:** جارێ لەنێو کەشتی بایەکی توند و تیژ هات، خەڵکەکە زۆر ترسان، ئیبراهیمی ئەدهەم گوتی: لە ئەوە بترسن، کە دەرۆزە بکەن.
- **٤٨٤- بازرگانی بەخشندە: دەگێڕنەوە:** لە یونسی عبید کە بازرگان بوو کوتاڵی دەفرۆشت، بە برازاکەی گوت: من بۆ نوێژ دەچم، نرخی ئەم کوتاڵانە بە ٢٠٠ درهەمە. لەپاش کەمێك پیاوێ هات برازاکەی بە ٤٠٠ درهەمی فرۆشت. یونس لە ڕێگە تووشی کڕیار بوو . زانی کوتاڵی خۆیەتی گوتی: بە چەندت کڕیوە؟ کابرا گوتی: ٤٠٠ درهەم یونس گوتی: بچینە دوکان ٢٠٠ درهەمت بدەمەوە . کابرا گوتی: من ڕازیم لە شارەکەی ئێمە بە ٥٠٠ درهەمە . یونس ٢٠٠ درهەمی دایەوە و زۆریشی لە برازاکەی دا.
- **٤٨٥- ئاهەنگی ژن گواستنەوە: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئاهەنگی ژن گواستنەوە بەنە مزگەوت و دەفیش لەگەڵیدا لێ بدەن. (ت. حسن).
- **٤٨٦- گەمە و یاری لەگەڵ خێزان: دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) یاری (ڕاکردن)ی لەگەڵ عائشەی خێزانی کردو لێی بردەوە. عائشەش جارێك لە پێغەمبەری بردەوە. جا پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەوە بە ئەو.
- **٤٨٧- ئامۆژگاری لوقمان بۆ پیاوی ژندار:** دەگێڕنەوە: گوتی: ڕۆڵە خۆت لە ژنی خراپ بپارێزە. چونکە لەپێش پیر بوون، پیرت دەکات. ژنی خراپ داوای چاکە ناکات. بگرە لە ژنی چاکیش بترسە.
- **٤٨٨- پێغەمبەر (ﷺ) فاتیمەی کچی: دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوت، چ شتێ بۆ ژن چاکە ؟ گوتی: باوکە ژن پیاو نەبینێ و پیاویش ژن نەبینێ. پێغەمبەر (ﷺ) لە باوەشی گرت و گوتی: قسەکەت تەواوە.
- **٤٨٩- پێغەمبەرو (ﷺ) هێزی پیاوەتی:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەی نۆ ژنی هەبورە، چووەتە لای هەر نۆیان لە جارێکدا. (ب).
- **٤٩٠- شێوەی دروست بوون: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەکەن وەك ئاژەڵ یەکسەر بچنە لای ژنەکانتان. با پەیام نێری لە نێوانتادا هەبێ. گوتیان پەیام نێر چیە؟

فەرمووی: گەمەو ماچ کردن لەگەڵی، ئینجا دروست بوون.

- **٤٩١- پەلە کردن لەژن هێنان: دەگێڕنەوە:** پێشەوا عەلی هەفتەیەك لەپاش مەرگی فاتیمەی خێزانی، کە کچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو ژنی هێنا.
- **٤٩٢- گەورێتی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئادەم: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من بەدوو شت لە ئادەم پێغەمبەر گەورە ترم. یەکەم ژنەکەی ئەو یارمەتی دا لەسەر خراپە. ژنەکانی من یارمەتیم دەدەن لەسەر خودا پەرستی. دووهەم ئەو لە شەیتانی خۆی ئاسایش نەبوو. من لێی ئاسایشم. (م).
- **٤٩٣- سێ شتی چاك: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من لە جیهاندا سێ شتم خۆش دەوێت بۆنی خۆش. ژن . نوێژ گلێنەی چاومە (ان حاكم جيد قال العقيلي ضعيف)
- **٤٩٤- منداڵ و خێزان لەدوا رۆژدا: دەگێڕنەوە** لە رۆژی دوایی منداڵ و خێزان لەلای خودا رادەوەستن دەڵێن: خودایە ئێمە بەخێوکەرمان (باوانمان، مێردمان- خواردنی نارەوای بۆ ئێمە کۆ دەکردەوە، تۆڵەمان وەربگرەوە!.
- **٤٩٥- تەڵەکە بازی لەکاتی داخوازی: دەگێڕنەوە** ك لەسەردەمی عومەر پیاوێ چووە داخوازی ژنەك. ئەوانیش لێیان مارە کرد، لەپاش ماوەیەك دەرکەوت کابرا سەرو ریشی سپی بوو. تومەز دەرمانی لێدا بوو. پێشەوا عومەر لێی دا.
- **٤٩٦-دانیشتنی ژن و مێردی نامەحرەم: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرمووی لەلای ژنێ دامەنیشن مێردەکەی لەوێ نەبێ، چونکە شەیتان لەنێو شتان وەك خوێن هات و چۆ دەکات . گوتیان تۆش گوتی: بەڵێ! بەڵام خودا یارمەتی داوم لەسەر شەیاتەنەکەم. خودا ئاسایشی کردوومە.(ت. م).

- **٤٩٧- دەست پەڕ: دەگێڕنەوە:** جارێ کوڕی عەبدوڵلای عەباس ئاوەدان بوو. کاتێ خەڵکەکە رۆیشتن، عەبدوڵلا بە گەنجێکی گوت: تۆ چ کارێکت هەیە؟ گوتی: لەبەر ئەو کۆڕە شەرمم کرد. ئێستا شەرم لەتۆ دەکەم، عەبدوڵلا گوتی: شەرم مەکە مامۆستا وەك

باوکە. گوتی من هەزارم دەستپەڕ لێدەدەم دروستە ؟ عەبدوڵلاَ گوتی: کەنیزەیەك بگۆزیەوە چاکترە. واتا هەر چەند منداڵت دەبێتە بەندە.بەڵام لەو تاوانە ڕزگار دەبی.

- ٤٩٨- **ئامۆژگاری بۆ بێ ژنان: دەگێڕنەوە** لە عەبدوڵلاَی مەسعود: گوتی: ئەگەر تەمەنم دە ڕۆژ مابێ، پێم خۆشە ژن بهێنم.
- ٤٩٩- **پێشەوا عومەر و ژن هێنان: دەگێڕنەوە:** دەیگوت پێم خۆشە، زۆر ژن بهێنم تاکو منداڵم زۆر بێ.
- ٥٠٠- **پارمەتی پیاو بۆ ژن هێنەران: دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر به پیاوێکی گوت: بۆ ژن ناهێنی ؟ کابرا گوتی: هەژارم . دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ژن ناهێنی؟ گوتی: هەژارم پارەم نییە. کابرا لە خەیاڵی خۆی گوتی: ئەگەر ئەمجارە پێغەمبەر بڵێ ژن ناهێنی دەڵێم تۆ بۆم بهێنە. لەجاری سێهەم پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ژن ناهێنی ؟ کابرا گوتی: تۆ بۆم بهێنە. پێغەمبەر فەرمووی . بڕۆ داخوازی فلان کچ بکە، چوو پێیان نەدا. پێغەمبەر (ﷺ) بە یارانی گوت: زێڕ خڕکەنەوە . بە ئەندازەی دەنکە قەسپێ زێڕیان خڕ کردەوە، ئینجا فەرمووی پارەی مەڕێکیشی بۆ خڕ بکەنەوە بۆ داوەتی بووك گواستنەوە .
- ٥٠١- **ژن هێنان سونەتێکی کۆنە: دەگێڕنەوە** پیاوێکی زۆر چاك هەبوو. خودا بە پێغەمبەری ئەو کاتی گوت: فیسار زۆر چاکە بەڵام ژنی نییە. پێغەمبەرەکە بە کابراکەی گوت. ئەویش گوتی.هەژارم بۆیە ژنم نییە. پێغەمبەرەکە کچی خۆی لێ مارەکرد.
- ٥٠٢-**ئامۆژگاری حەسەنی بەصری دەگێڕنەوە:**گوتی:ئەگەر خوداکەسێك بەختەوەر بکات،خەریکی ناکات بە منداڵ و خێزان.
- ٥٠٣- **قازانجی منداڵ مردن: دەگێڕنەوە** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەڕۆژی دوایی خودا بە منداڵەکان دەڵێ بڕۆنە بەهەشت . دەڵێن ناچین تا باوانمان لەگەڵ نەیەت. خودا پێیان دەڵێت خۆتان و باوانتان بڕۆنە بەهەشت. (ن . اسنادە جید)
- ٥٠٤- **دیتنی ژنی بێگانە : دەگێڕنەوە** لەجابر جارێ ژنێ هاتە لای زینب بۆ کارێ لە پاشاندا ڕۆیشت، پێغەمبەر(ص) فەرمووی: ژن دێتە پێش چاوی پیاو لەسەر شێوەی شەیتان کاتێ یەکێك لە ئێوە ژنێکی دیت با بچێتە لای خێزانەکەی خۆی . چونکە ئەوەی

بەژنەکەوەیە بە ژنەکەی ئەویش وەیە. (م.ت, صحیح).

- ٥٠٥- **نوێـژی پێـشەوا عـەلی: دەگێڕنـەوە:** کـاتێ کـاتی نوێـژدەهات، ڕەنگـی دەگـۆڕا، پرسیاریان لێ کرد بۆچی ئاوات بەسەر دێت فەرمووی: کاتی دانەوەی سپاردەیەکە کـە بـە هەفت ئاسمان و زەمـین و کێوەکـان وەرنـەگیرا. ئاراسـتەی مـرۆڤ کـرا. جـا چـۆن ڕەنگـم نەگۆڕێ.
- ٥٠٦- **نوێژی حاتەمی اصم: دەگێڕنەوە** دەیگوت: کـاتێ کـاتی نوێـژ هـات دەسـت نوێـژ دەشۆم و نیەتی نوێژەکەم دەهێنم و کەعبە دەخەمە نێوان برۆیەکانم و پردی سیرات دەخەمە بن پێیەکانم و بەهەشت لـەڕاستم و دۆزەخ لە چەپەم و عزرائیل لـەدوام، وا دادەنێم کـە دوا نوێژمە، ئینجا فاتحە و چەمینەوە و سوژدەکان بەجوانی ئەنجام دەدەم.
- ٥٠٧- **وازهێنان لەخودا پەرستی:** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: کەسـێك خـودا پەرستیەك بکات، لە پاشاندا تەرخی بکات، خودا سزای دەدات.
- ٥٠٨- **چرا پێکردن لە مزگەوتـدا: دەگێڕنـەوە** لـە ئەنـەس گـوتی: کەسـێك چـرایەك لـە مزگەوتدا دابگیرسێنێ، فریشتەکانی خودا داوای لێ خۆشبوونی لەخۆدا بۆ دەکەن. تا ئەو چرایە بمێنێ.
- ٥٠٩- **گەورێتی جێی نوێژ: دەگێڕنەوە:** لە پێشەوا عەلی فەرمووی: کاتێ بەندەیـەکی نوێـژ کەر دەمرێت جێی نوێژەکەی لە زەویدا بۆی دەگرێ، و جێی پاداشتەکەی لە ئاسماندا بۆی دەگریێ، عەبدوڵلا عەباس گوتی: چل ڕۆژ بۆی دەگریێ. ئەو ئایاتەیان کردە بەڵگە . (فمـا بکت علیکم السماء والارض وما کانوا منظرین).
- ٥١٠- **پیاوێکی لەخودا ترس: دەگێڕنەوە:** پیاوێك هەبوو بە ناوی (ڕەبیعـی خەیـسەم) ئـەو پیاوە هەرگیز چاوی بڵند نەکرد. نزیکەی ٢٠ ساڵ هاتوچۆی عەبدوڵڵای مەسعودی کـرد. جارێ لە دەرگەی دا کەنیزەکـەی عەبـدوڵڵای مەسـعود گـوتی: پیـاوە کوێرەکـە هـات، عەبدوڵلا بە گرژیەوە گوتی: ئەوە کوێر نیە. بەڵام نەزەر ناکات. چـوونە نـاو ئاسـنگەران ڕەبیع کە ئاگر و ئاسنی دیت لـەخۆ چـوو لەترسی دۆزەخ. ئـەوڕۆژە تـا بـەیانی بـەخۆی نەهاتەوە!.

- **٥١١- دوا نوێژی پێغەمبەر** : دەگێرنەوە: دوا نوێژی پێغەمبەر (ﷺ)نوێژی مەغریب بوو کە سورەتی (المرسلات) ی تیادا خوێند.
- **٥١٢- هەنگاو رۆیشتن بەسەر شـان و بـاڵی خـەڵك**: دەگێرنـەوە: جـاریٚ پێغەمبـەر (ﷺ) وتاری دەخوێندەوە، پیاویٚ بەسەر شان و باڵی خەڵك هەنگاوی هاوێـشت . تاچـووە پـێش پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت کە وتارەکە و نوێژەکە تەواو بـوو. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: بۆچی لەگەڵ ئێمە نەهاتیە، هەینی ؟ کابرا گوتی: هاتم، پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی ئەوە بوو، کە هەنگاو هاوێشتنەکە کارێکی خراپ بوو.
- **٥١٣- قـسەکردن لـەکاتی وتـار خوێندنـەوە: دەگێڕنـەوە**: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: کەسێك لەکاتی وتار خوێندنەوە بە کەسێك بڵێ: وس بە. ئەوە پاداشتی وتاری هـەینی لـە دەست دەڕوات.
- **٥١٤- سودی نوێژی کۆمەڵ: دەگێڕنەوە**: لە پێشەوا عومـەر گـوتی: ئەگـەر دۆسـتێکتان لـە نوێژی کۆمەڵ نەدیت بڕۆن دیدەنی بکەن، ئەگەر نەخۆش بوو، ئەوە هەقی خۆیەتی، ئەگـەر ساغ بوو ڕیسوای بکەن بڵێن بۆ نەهاتی!
- **٥١٥- نوێژی چەشتەنگا : دەگێڕنـەوە**: لـە (ام هـانی) خوشـکی پێـشەوا عـەلی: پێغەمبـەر (ﷺ) نوێژی چەشتەنگانی دەکرد هەشت ڕکاتی درێژ و بە جوانی.
- **٥١٦- ڕیزدارەکان: دەگێڕنەوە**: لە کـەعب گـوتی: لەشـاران مکـە ریـزدارە. لـە مانگـان رەمەزان. لە رۆژان هەینی. لەشەوان شەوی قەدر.
- **٥١٧- نەچوون بۆ نوێژی هەینی: دەگێڕنەوە**: پیاوێ هاتە لای عەبـدوڵڵای عـەباس گـوتی: پیاوێ مردووە نوێژی هەینی و نوێژی کۆمەڵی نەدەکرد. عەبدوڵڵا گوتی: لە دۆزەخـە، تـا مانگێ ئەو پرسیارەیان لێ کرد، هەر دەیگوت لە دۆزەخە.
- **٥١٨- گرنگی خۆشۆردنی هەینی: دەگێڕنەوە**: لە هەندێ هاوەڵان کوڕێك لە ڕۆژی هـەینی خۆی شۆرد، باوکەکە گوتی: لەبەر هەینی خۆت شۆرد کوڕەکـە گـوتی نـەءلەشـم پـیس بوو. باوکەکە گوتی:دووبارە خۆت بشۆ بەناوی هەینی.
- **٥١٩- هەینی لە سەدەی یەکەم: دەگێڕنەوە**:خەڵك لـە سـەدەی یەکـەم سـەرلە بـەیانی بـۆ

نوێژی هەینی دەچوون. بگرە لەبەر تاریکی هەموو چرایان لە دەست دابوو. بەڵام خەڵک سست بوون، وەك ئێستا، کە هەندێ کەس لەگەڵ بانگ دەچێت، هەندێ لەنێو وتار . هەندێ ناچێت.

• ٥٢٠- **میز کردن بە ڕاوەستان: دەگێڕنەوە:** لە عائشە گوتی: هەر کەسێك بڵێ پێغەمبەر میزی بە ڕاوەستان کردووە باوەڕی پێ مەکەن، پێشەوا عومەر گوتی: جارێ من میزم بەڕاوەستان دەکرد. پێغەمبەر (ﷺ) منی دیت و بانگی کردم و گوتی: میز بەڕاوەستان مەکە، لە ئەو ڕۆژە بەدوا، میزم بە ڕاوەستان نەکردووە.

• ٥٢١- **پێش نوێژی کردن بەبێ پرسی خەڵك: دەگێڕنەوە:** لە النفعی گوتی: کەسێك بەبێ پرسی کۆمەڵێك، پێش نوێژیان بۆ بکات، وەك پیاوێکە ئاوی دەریا بکێشی، کە نازانێ چەندی کێشاوە و چەندی ماوە!.

• ٥٢٢- **نەچوون بۆ نوێژی کۆمەڵ: دەگێڕنەوە:** لەئەبوهورەیرە گوتی: کەسێك گوێی لەبانگ بێ و نەچێ بۆ نوێژی کۆمەڵ زۆر چاکتر بوو بۆی گوێی پڕ لەمس بوایە.

• ٥٢٣- **سەعیدی موسەیب و نوێژی کۆمەڵ: دەگێڕنەوە:** گوتی: ماوەی ٢٠ ساڵە هەر بانگدەرێ بانگی دابێ، من بە نوێژی کۆمەڵ گەیشتوم.

• ٥٢٤- **خۆ بەکەم زانین لەکاتی بەر نوێژی: دەگێڕنەوە:** لە(ئەبو عبیدە جراح) گوتی: جارێ پێش نوێژیم کرد. لەنێو نوێژەکە شەیتان وای لێ کردم، کەوا من لە هەموویان گەورەترم، بۆیە لە ئەو ڕۆژ بەدوا پێش نوێژیم نەکرد.

• ٥٢٥- **زۆر کڕنۆش بردن:** دەگێڕنەوە: لە (عەلی عەبدوڵلای عەباس) ڕۆژێ هەزار جار سوژدەی بۆ خودا دەبرد. بۆیە نازناوی سوژدەبەر بوو.

• ٥٢٦- **خۆ خوران لە نوێژدا: دەگێڕنەوە:** جارێ (سەعیدی مسیب) پیاوێکی دیت لەناو نوێژەکەیدا ڕیشی دەخوراند. سەعید گوتی: ئەگەر ئەو پیاوە لەخودا بترسابوایە، جەستەشی دەترسا.

• ٥٢٧- **نوێژ کردن بە ئەدەبەوە: دەگێڕنەوە:** بە خەلەفی ایوبیان گوت: لەنێو نوێژ چۆن ئەوەندەی مێشولە دێتە سەر دەم و چاوت دەری ناکەیت ؟ گوتی: پیاوێکی خراپ لە

بەندیخانە نهێنی خۆی ئاشکرا ناکات، ئەوەندەی ئازاری دەدەن. جا من چۆن لەبەر مێشولەیەك ئارامیم نەبێ؟!.

- ٥٢٨-**نوێژکەری چاك: دەگێڕنەوە**:لە (مسلمی یسار) ئەوەندەی منداڵەکانی لەکاتی نوێژ قسەیان دەکرد، ئەو هیچ گوێی لێ نەدەبوو. هەتا جارێ لە مزگەوت ... لایەکی دیوارەکە کەوتە خوار ئەو لەنێو نوێژ بوو هەستی پێ نەکرد، دەیگوت قسە لەگەڵ خودا دەکەم!.
- ٥٢٩- **مرۆڤ بە ئەندازەی ئەقڵی پلەی بەرز دەبێ: دەگێڕنەوە**: کۆمەڵە کەسێك لەلای پێغەمبەر (ﷺ)باسی خودا پەرستی و چاکی پیاوێکیان دەکرد. پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: هۆشی چۆنە ؟ گوتیان ئێمە دەڵێین ئەوەندە و ئەوەندە خودا پەرست تۆ دەڵێی هۆشی چۆنە ؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: بەڕاستی پیاوی ئەحمەق پتر تووشی نەفامی دەبێ لە پیاوی فاجر، بەندەکان بەیانی لەلای خودا بە ئەندازەی هۆشیان پلەیان بەرز دەبێ. (ابن المجبر).
- ٥٣٠- **گەورێتی ئەقڵ: دەگێڕنەوە**: لە پێشەوا عومەر لە پێغەمبەر (ﷺ)هیچ شتێ بۆ پیاو وەك ئەقل چاك نییە کە خاوەنەکەی بۆ ڕێ نومایی دەبا و لە گومڕایی دەگێڕێتەوە باوەڕی بەندە تەواو نەبووە و ئایینەکەی ڕانەوەستاوە تاکو هۆشی تەواو نەبێ؟ (ابن المجبر و الحارث بن ابی اسامه).
- ٥٣١- **ڕوخۆشی لە هۆشەوەیە : دەگێڕنەوە**: پێغەمبەر ر فەرمووی: پیاو بەهۆی ڕووخۆشی پاداشتی ڕۆژوگرو شەو نوێژەکەی دەست دەکەوێت. ڕووخۆشی پیاویش تەواو نابێ تا هۆشی تەواو دەبێ. کە هۆشی تەواو بوو باوەڕی تەواو دەبێ بە گوێی خودا دەکا و بەگوێی شەیتانی دوژمنی ناکات. (ابن المجبر. ت . عائشة صحیح).
- ٥٣٢- **گەورێتی زانا: دەگێڕنەوە** پرسیاریان لە (ئیبن المبارك) کرد. خەڵکان کێنە ؟ گوتی: زانا . پادشایان کێنە؟ گوتی: زاهید . بێ نرخەکان کێنە ؟ گوتی: ئەوانەی بەهۆی ئایین جیهانیان دەست دەکەوێت.
- ٥٣٣- **مرۆڤ بەبێ زانست دڵی دەمرێ**: دەگێڕنەوە: لە (فتح الموصلی) گوتی: ئایا ئەگەر نەخۆش خواردن و دەرمانی لێ قەدەغە بکرێت نامرێت؟ گوتیان: بەڵێ، گوتی: کەواتە کەسێك لە ماوەی سێ ڕۆژ گوێی لە ئامۆژگاری ئایینی نەبێ دەمرێت.

- ٥٣٤- **دووركردنـەوەى زانـست:** **دەگێڕنـەوە:** لـە عەبـدوڵڵای عـەباس و ئـەبو هـورەیرە و ئەحمەدی حەنبەل و شافیعی دووری کردنەوەی کەمێك زانست لە شەودا، چاکترە لەشەو نوێژ.
- ٥٣٥- **زانست پلەت بەرز دەکا** . **دەگێڕنەوە:** لە (سالمی ابی جعد). گوتی: مـن بەنـدە بـووم گەورەکەم منی بەسێ سەد درهەم کڕی. لە پاشاندا ئازادی کردم. گـوتم باشـە چ کارێـك بکەم؟ هەڵسام ساڵێك خەریکی خوێندن بووم. دواتر گەورەی مەدینە هاتە ماڵم بۆ سەردان ڕێم پێ نەدا.
- ٥٣٦-**نێـوانی زانـا و پێغەمبـەران:** **دەگێڕنـەوە:** پێغەمبـەر(صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: کەسێك خەریکی خوێندنی ئایەتێ بـێ و فریـشتە گیـانی بکێـشێ، ئـەوە لـە بەهەشت لەگەڵ پێغەمبەران یەك پلەیان لەنێواندایە.
- ٥٣٧- **زانست خواز:** **دەگێڕنەوە:** لە(ئەبو الدرداء) گوتی: بە زانـا یـا بـە فـەقێ. یـا گـوێ ڕابگرە. مەبە چوارەم لەناو دەچیت.
- ٥٣٨- **پرسیار کردن لە زانایـان:** **دەگێڕنـەوە:** لـە (عـەتاء ) گـوتی: جـارێ چـوومە لای (سەعیدی مسیب) دەگریا: منیش گـوتم ئـەوە بـۆ ؟ گـوتی: مـاوەی سـێ ڕۆژە کەسـێك پرسیارێکی ئایینی لێ نەکردومە، حەسـەنی بەصـری فەرموویـەتی: ئەگـەر لەبـەر زانایـان نەبوایە، خەڵکان وەك گیانلەبەر دەبوون.
- ٥٣٩- **زانا لە باوك و دایك چاکترە:** **دەگێڕنەوە** لە (یەحیای معاذ) گوتی: زانا لە دایـك و باوك چاکترە! گوتیان: چۆن ؟ گوتی: دایك و باوك منداڵی لە ئاگر ڕزگار دەکـات، بـەڵام زانا لە ئاگری دۆزەخیان ڕزگار دەکات.
- ٥٤٠- **زانستی پیاو چاکان:** **دەگێڕنەوە:** پێشەوا شـافیعی لەبـەر دەسـتی نـاو (شـەیبانی) دا دادەنیشت و دەیگوت فیسار پرسیار و فیسکە پرسیار ئەنجامی چی یە ؟ خەڵکان دەیانگوت باشە چۆن شافیعی پرسیار لەئەو شەیبانە دەکات ؟ دەیگوت: من دەزانم ئەو کابرایە زانستی ناوەوەی هەیە. (علم الباطن)
- ٥٤١- **زانستی بێ سوود و نەزانی بێ زیان:** **دەگێڕنەوە** جـارێ کۆمـەڵێ هـاوەڵی پێغەمبـەر

(ﷺ) دەورەیان لـە پیاوێك دابوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو پیاوە چـی یـە ؟ گوتیـان زۆر زانایە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لـەچی ؟ گوتیان هـۆنراوە زانـە و ڕەچـەلـەك زانـە . فەرمووی زانای بێ سوود و نەزانێکی بێ زیان.

- **٥٤٢- زانای ژیر: دەگێڕنەوە:** پیاوێ ژنەکـەی بـردە لای پزیـشك گـوتی: منـداڵی نـابێ ؟ پزیشك سەیری دەماری کرد و گوتی: ئەوە لەپاش چل ڕۆژی تر دەمرێت. ژنە لــە ترسـان نانی پێ نەدەخورا زۆر لاواز بوو. کاتێ چل ڕۆژ تێپەڕی نەمرد. پیاوەکەی بە پزیـشکەکەی گوت: ئەی بۆ تۆ گوتت شڕەو دەمرێت گوتی: ئەو ژنە قەڵەو بوو. دەمی ڕەحمـی هـەمووی چەوری بوو. بۆیە ترساندم تاکو لاواز بێ. ئینجا ان شاء اللە منداڵی دەبێ.
- **٥٤٣- شێوازی زانست بلاوکردنەوە:** دەگێڕنەوە: لە عیسا پێغەمبـەر گـوتی: زانـست لــەلای کەسێك بلاومەکەنەوە کە بە زایەی بدات و ستەمی لـێ بکـەن. زانـست لــە کەسـێکیش قەدەغە مەکەن کە پەرۆشیەتی ستەمی لـێ بکـەن، وەك پزیـشك بـن کـە دەرمـان لــەجێی نەخۆش دادەنێ..
- **٥٤٤- لەسەرووی هەموو زانایەك زانایەکی تر هەیە:دەگێڕنەوە** پیاوێ پرسـیاری لەپێـشەوا عەلی رد.پێشەوا عەلیش وەلامی دایەوە کابرا گوتی:وەرامەکەت هەڵەیـە مـن پێـت بڵـێم ئەوهایە عەلی گوتی: راست دەکەی من هەڵــەم.لەسـەرووی هـەموو زانایـەك زانایـەکی تـر هەیە.
- **٥٤٥- زانست بە ژن و پیاوەتی نییە: دەگێڕنــەوە:** پێـشەوا عومـەر وتـاری دەدا لــە ڕۆژی هەینی، ژنێ لەنێو ئەو هەموو پیاوە گوتی: ئەی عومـەر ئـەو ئامۆژگاریـەت هەڵەیـە، کـاتێ ژنەکە بۆی ڕاست کردەوە، پێشەوا عومەر گوتی ژنێ زانی. پیاوێ نەیزانی.
- **٥٤٦- زانا و نەتەوەی پێغەمبەر (ﷺ): دەگێڕنەوە:** لە شعبی جارێ زیدی سابت نوێـژی لەسەر تەرمێ کرد. عەبدوڵلای عەباس ولاخی سواری بـۆ زەیـد هێنـا، کـە جەلەوەکـەی لەدەست دابوو. زید گوتی لاچۆ ئەی کوڕە مامی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو ئـازارەت کێـشا؟ عەبدوڵلا گوتی: فەرمانمان پێ کراوە بەم چەشنە ڕێزی زانایان بگـرین. زەیـد دەسـتی مـاچ کرد.

- **٥٤٧- زانای بەزمان: دەگێڕنەوە:**لە پێشەوا عومەر گوتی: بەڕاستی لەهەموو شتێ کە مەترسیم پتر لێی هەیە، زانای بەزمانی مونافیقە گوتیان: مونافیق چۆن زانا دەبێ؟ گوتی: بە زمان زانایە. بەدڵ نەفامە.

- **٥٤٨- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: وەك ئەو کەسانە نەبن کە زانست و قسەی خۆش کۆدەکەنەوە. کەچی ڕەفتاریان ڕەفتاری گێلانە.
- **٥٤٩- پەشیمانترین کەس:** دەگێڕنەوە: لە ئیبراهیمی عیینە گوتی: لە جیهاندا پەشیمانترین کەس ئەو کەسەیە کە چاکە لەگەڵ یەکێك بکا و کابرای چاکە بۆ کراو بەهیچی دانەنێت. لەدوا ڕۆژیش زانایەکە کاری بە زانستەکەی نەکردبێ.
- **٥٥٠- ئامۆژگاری بۆ زانایان:** دەگێڕنەوە: لە سوفیانی ثوري گوتی: زانست بانگی زانا دەکا و دەڵێ کارم پێ بکە. ئەگەر کاری پێ نەکرد، دەڕوات ئیبن المبارك گوتی: مرۆڤ تا داوای زانست بکات زانایە. کە خۆی بەزانا زانی نەفامە.
- **٥٥١- زانای خراپ: دەگێڕنەوە:** لە عیسا پێغەمبەر گوتی: چەشنی زانای خراپ وەك بەردێکە بکەوێتە نێو دەریا. ئەوبەردانە ئاو ناخواتەوە و جێشی گرتوە.
- **٥٥٢- ئامۆژگاری سهل: دەگێڕنەوە:** دەیگوت خەڵکان هەموو مردونە جگە لە زانایان، زانایان هەموو سەرخۆشن. جگە لە ئەوانەی کار بە زانستەکەیان دەکەن. ئەوانەی کار بە زانستەکەیان دەکەن. مەغرورن جگە لە دڵسۆزان. دەترسن لەخۆیان تا کارتی سەربەرزی وەردەگرنەوە.
- **٥٥٣- زانای دوارۆژ: دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێکی خوراسانی هاتە کۆڕی حەسەنی بەصری کە گوێی لە ئامۆژگاریەکانی گرت بۆ خوراسان گەڕایەوە و پێنج هەزار دەرهەم و جلوبەرگی بەدیاری بۆ هێنا حەسەن گوتی: لەخۆت و منداڵتی خەرج بکە. ئەوەی وەری بگرێ لەدوا ڕۆژ بەشی نییە.
- **٥٥٤- زانایەك بووە بەراز: دەگێڕنەوە:** لەسەردەمی موسا پێغەمبەر پیاوێ زۆر لەلای موسا پێغەمبەر دادەنیشت زانستێکی زۆر فێر بوو. خەڵك لەبەر زانستەکەی پارە و پولیان پێ

دەدا. ماوەیەك ئەو پیاوە بزر بوو. ڕۆژێ کابرایەك هاتە لای موسا پێغەمبەر بەرازێکی لەدوو خۆی ڕادەکێشا، گوریسێکی ڕەشی لە گەردن بوو. موسا بە پیاوەکەی گوت: ئەرێ فیسار زانا ناناسی گوتی: ئەو خۆیەتی، بە زانستی جیهانی دەست کەوتوە.

- **٥٥٥- زانایان بۆ چونەتە دۆزەخ: دەگێڕنەوە:** لەڕۆژی دوایی کۆمەڵە کەسێکی بەهەشتی بە کۆمەڵە کەسێکی دۆزەخ دەڵێن ئێوە بوونە هۆی ئەوەی کە ئێمە هاتووینەتە بەهەشت. بۆچی خۆتان لە دۆزەخن؟ دەڵێن ئێمە ئەوەی دەمان گوت،کارمان پێ نەدەکرد!.
- **٥٥٦- ئەوەی دەیزانی کاری پێ بکە. دەگێڕنەوە:** لەئیبراهیمی ئەدهەم دەڵێ: جارێ چوومە مەککە بەردێکم دیت لەسەری نوسرابوو: سەیری ژێرەوەم بکە: ئامۆژگاری وەردەگری. کە سەیرم کرد نوسراوە: تۆ ئەوەی دەیزانی کاری پێ ناکەی.جا چۆن داوای زانستێ دەکەی کە هێشتا نایزانی.
- **٥٥٧- ئامۆژگاری عیسا پێغەمبەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەو زانایەی کار بە زانستەکەی ناکات، وەك ژنێکە زینا بە دزی بکات. دوایی لەپاش ماوەیەك بە هۆی سکەکەی لێی ئاشکرا دەبێ. زاناش ئەگەر کار بە زانستەکەی نەکات لەڕۆژی دوایی خودا وەك ژنەکە لەنێو خەڵك لێی ئاشکرا دەکات.
- **٥٥٨- پیاوێ وازی لەزانست هێنا. دەگێڕنەوە:**لەسری سەقەتی گوتی: پیاوێ دۆستم بوو وازی لەزانست هێنا، گوتم بۆ وازت هێنا؟ گوتی:لەخەودا دەنگێ هاتگوتی:ئەو زانستە تا کەی بە فیرۆ دەدەی خودا بە فیرۆت بدات،واتا:هەر خۆت فێر دەکەیتوکاری پێ ناکەیت.
- **٥٥٩- زانست بۆ کارە.** نەك هەر زار. دەگێڕنەوە: لەمکحول لەعەبدولڕەحمانی مغنم گوتی: گوێم لەدە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە. جارێ هاوەڵان لەمزگەوتی قوباء قورئانیان دەخوێند. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی دەتانەوێ فێربن.فێربن بەڵام خودا پاداشتتان پێ نادات تا کاری پێ نەکەن.
- **٥٦٠- دەشتەکی نەخوێندەوار. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەسێك بوە دەشتەکی چۆڵو بیابان، بە ڕاستی جەفادراوە. ئەگەر بووە ڕاوچی بێ ئاگایە. ئەگەر چووە

دەرگەی پاشایان تووشی فرتێنەبووە.

- **٥٦١- وەرام دانەوەی پرسیار. دەگێڕنەوە:** کاتێ پرسیاریان لەعەبدوڵلای عومەر دەکرد دەیگوت نازانم، هەتا جارێ -١٠- پرسیاریان لێ کرد، یەك پرسیاری وەڵام دایەوە. دەیگوت دەتانەوێ بۆتان ببمە پردی دۆزەخ!
- **٥٦٢- پێشەوا عومەرو وەڵام دانەوە. دەگێڕنەوە:** لە (ئیبن حصین) دەیگوت ئەو پرسیارانەی ئاراستەی ئێوە دەکرێ. دەست بە جێ وەڵام دەدەنەوە؟ ئەگەر ئاراستەی پێشەوا عومەر بکرابوایە، هەموو خەڵکی بەدری کۆدەکردەوە بۆ وەڵام.
- **٥٦٣- نیشانەی زانایەتی. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی نیشانەی زانای شارەزا ئەوەیە وتاری کورتە. نوێژی درێژە. ئەبو سلێمان گوتوویەتی: ئەگەر زانست زۆر بوو قسە کردن کەم دەبێ. ئەگەر زانست کەم بوو قسە کردن زۆر دەبێ .
- **٥٦٤- زانستی پزیشکی. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) سەلمان‌و ئەبو الدردائی کردە دۆست. جا ئەبو الدرداء خەریکی پزیشکی بوو. سەلمان نامەیەکی بۆ نووسی: برا ئەگەر لەپزیشکایەتی دەزانی ئەوە چاکە. ئەگینا بۆ خاتری خودا خۆت بە خەڵك فێر مەکە، لەپاش ئەم نامەیە، ئەبو الدرداء زۆر قسەی لەبارەی دەرمان نەدەکرد.
- **٥٦٥- پەرتووکە ئایینیە یەکەمینەکان. دەگێڕنەوە:** یەکەم پەرتوکی داندرا پەرتوکی (الأثار) بوو لەنوسینی ئیبن جریج. هەروەها پەرتوکی(حروف التفاسیر) لەنوسینی موجاهد عطاء عەبدوڵلای عەباس، لەپاشان پەرتوکی مەعمەر راشیدی صنعانی، ئینجا (الموطأ) پێشەوا مالك بوو.
- **٥٦٦- زمانت بگرە. دەگێڕنەوە: لەدانایان:** زمانت بگرە مەگەر لەکاتی قسەکردن لەهەقێ، یا لەناهەقێ، یا ئامۆژگاری، یا نازێکی خودا.
- **٥٦٧- قسەی خێر خێرە. دەگێڕنەوە:** بە ایاسی معاویەیان گوت: تۆ زۆر قسە دەکەی؟ گوتی: قسەکانم خێرە یا شەرە. گوتیان: خێر.گوتی: کەواتە خێر هەرچەندە زۆر بێ کەمە.
- **٥٦٨- جۆرەکانی بەندە. دەگێڕنەوە:** لەزانایان سێ جۆر بەندە هەیە: بەندەی بەندە، بەندەی ئارەزوو، بەندەی تەماع.

- **٥٦٩- ئازادی. دەگێڕنەوە:** لەدانایان ئەگەر کەسێك پێی خۆشە بە ئازادی بژی، بـا چـاوی لەسامانی خەڵك نەبێ.
- **٥٧٠- شێوازی پیاوی خراپ. دەگێڕنەوە:** لەپێشەوا عەلی گـوتی: شـێوازی پـیاوی خـراپ ئەوەیە پەیڕەوی خراپەکانت بکات‌و پشتی لەچاکەکانت بکات وەك مێشوولە. کـە حـەزی لەجێی پیسە.
- **٥٧١- ڕاستی ڕزگارییە. دەگێڕنەوە:** لەزانایان ڕاستی ڕزگارییە هەرچەندە لێـی بترسـی.درۆ لەنێوچوونە هەرچەندە لێی ئاسودەبی.
- **٥٧٢- ڕاستی جوانییە. دەگێڕنەوە:** لەزانایان کەسێك گفتوگۆیەکانی ڕاست بوو. ئـەوە بـە هۆی هەر ڕاستیەك روخساری جوانتر دەبێ.
- **٥٧٣- شەرم کردن لەخۆ. دەگێڕنەوە:** لەدانایان: شەرم زیاتر لەخۆت بکە. ئینجا لەخەڵك. چونکە کەسێك کاری بە نهێنی بکاولەکاتی ئاشکرایی شەرمی بـەخۆبێ.ئـەوا ڕێـزی خـۆی لەلا نییە.
- **٥٧٤- هەژاری تـازە دەوڵەمەند. دەگێڕنەوە:** لەدانایان ئەگەر یەکێك لەکاتی منداڵی هـەژار بوو. لەپیری دەوڵەمەنـد بـوو، ئـەوە لـووتی بـەرز دەبـێ.بـەڵام ئەگـەر لـەکاتی منـداڵی دەوڵەمەند بوو بە پێچەوانەیە.
- **٥٧٥- دەوری سامان. دەگێڕنەوە:** لەکاتی پیری بە ئەفلاتونیان گوت: تۆ بە ئەو پیرییە بۆچی سامان دادەکەی؟ گوتی: ئەگەر مردم بۆ دوژمنم بێ، پێم خۆشترە. لەئەوەی لـەکاتی ژیـان داوای شتێ لەبرادەرێك بکەم.
- **٥٧٦- ئیبن زیادو دراو. دەگێڕنەوە:** پێیان گوت: بۆچی ئەوەندە حـەزت لـەپارە داکردنـە، کەچی لەجیهانت نزیك دەکاتەوە؟ گوتی: ڕاستە. بەڵام(بەهۆی پارە هەڵگرتن لـەجیهانیش دەوڵەمەندەبم) واتا پێویستیم پێی نابێ.
- **٥٧٧- دەست بڵاوی. دەگێڕنەوە:** لەدانایان هەرکەسێك دەستی بڵاو بێ، ئەگـەر سامانیـشی زۆر بێ ئەوا سامانەکەی نامێنێ. بەڵام ئەگەر هەژار بێ‌و دەستی بڵاو نەبێ ئەوە دەوڵەمەنـد

دەبێ.

- **٥٧٨- شێوەی پارە خەرج کردن. دەگێڕنەوە:** لەئەبوبەکری صدیق گوتی: کەسێك لەشێوەی میانە پارە خەرج بکات هەژار نابێ. هەروەها گوتی: من زۆر ڕقم لەئەو کەسەیە، کە خواردنی چەند ڕۆژێ لەڕۆژێکدا بخوات.
- **٥٧٩- نەرمو نیانی. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ جنێوی بە شعبی دا. ئەویش گوتی: ئەگەر وەك جنێوەکەی تۆمە خودا لێم خۆش بێ. ئەگینا لەتۆ خۆش بێ.
- **٥٨٠- وەڵام نەدانەوەی نەفام.** دەگێڕنەوە: لەدانایان ئەگەر وەڵامی پیاوی نەفامت نەدایەوە. بە راستی زۆرترین وەڵامت داوەتەوە. بگرە لێت داوە.
- **٥٨١- سوودی ڕاست گۆیی. دەگێڕنەوە:** لەپێشەوا عەلی گوتی: ئەوەی ڕاستگۆبە دەستی دێنێ. درۆزنی فێڵ باز بە دەستی ناهێنێ.
- **٥٨٢- درۆزن دزە. دەگێڕنەوە:** لەدانایان گوتیان: درۆزن دزە لەبەرئەوەی دزیکەر سامان دەدزێ. بەڵام درۆزن هۆش دەدزێ.
- **٥٨٣- زیانەکانی درۆ. دەگێڕنەوە:** لەدانایان: درۆ کۆی خراپەیە. ئەنجامی دووڕوویە. ئەنجامی دووڕویی ڕق بونەوەیە. ئەنجامی رق بوونەوە جەنگە. جەنگ ئاسودەیی تیادا نییە.
- **٥٨٤- شوکری چاوو گوێ. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ بە ئەبو هارونی گوت: شوکری چاو ئەوەیە کە شتێکی چاکت دیت یادی بکەی. ئەگەر شتێکی خراپت دیت سەیری نەکەی. شوکری گوێچکەش ئەوەیە ئەگەر گوێت لەقسەیەکی چاك بوو گوێی لێ ڕابگری. ئەگەر خراپ بوو لەبیری خۆتی بەی.
- **٥٨٥- سوودی دوژمن. دەگێڕنەوە:** لەزانایان، سوودی دوژمن ئەوەیە. وادەبێ کە کەمو کوریەکت هەبێ لێت ئاشکرا دەکات. بەڵام دۆست دڵی نایەت پێت بڵێ.
- **٥٨٦- دوو ڕوو. دەگێڕنەوە:** لەسەعیدی عدوە گوتی: ئەگەر نیو زمانو نیو رووم هەبێ چاکترە، نەك دووڕوو بم لەزمانو گوێ.
- **٥٨٧- خۆ سووك کردن. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای مەهدی گوتی: من بەندەی تۆم مەهدی گوتی: سەیرە یەکێك خۆی بکاتە بەندەی یەکێك، کە لەچەشنی خۆی بێ من ئەو کابرایە

بە درۆزن دادەنێم، ئەوەی ئەو قسەیەش پەسەند بکات شێتە.

- **٥٨٨- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لێ کرد چۆن خودا لەهەموو خەڵکە زۆرو زەبەنە دەپرسێتەوە؟ گوتی: ئەی چۆن ڕۆزییان دەدات.
- **٥٨٩- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: هیچ دەوڵەمەندیەك وەك هۆش نیە. هیچ هەژارییەك وەك نەفامی نییە. هیچ میراتێ وەك ئەدەب نییە. هیچ پشتگیرییەك وەك ڕاوێژ نییە.
- **٥٩٠- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتیان ئەگەر پیاوێ لەژوورێ کراو دەرگەی لێ پێوەدرا لەکێ خودا ڕۆزی پێ دەدا؟ گوتی: لەئەو جێیەی کە مەرگی بە سەر دادێ.
- **٥٩١- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: ڕۆژی دادێ بەسەر ئیسلامەتی تەنها ناوی دەمینێ. قورئان تەنها شێوەی دەمینێ. مزگەوت لەیادی خودا چۆڵەو خراپترین خەڵکی ئەو کات زانایەکانن، فرتێنە بە هۆی ئەوانەوە دێتو لەئەوانەوە دەگەڕێتەوە.
- **٥٩٢- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لێ کرد نزیکترین شت چی یە لە کوفر؟ گوتی: هەژاری بێ پشوو.
- **٥٩٣-ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:**گوتی من سێ شتم پێ خۆشە: لێدان بە شمشێر لەبێ باوەڕ ، خزمەتی میوان، ڕۆژوو لەهاویندا.
- **٥٩٤- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: خودایە مرۆڤ بە (چاو، بەز) شتان دەبینێو بەگۆشت قسە دەکاتو بەئێسقان گوێی لێیە.
- **٥٩٥- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: خودا پێنج شتی لەناو پێنج شت دانایە: گەورێتی لەخوداپەرستی یە، ڕیسوایی لە تاوان، زانایی لەبرسێتی یە، سام لەشەو نوێژە، دەوڵەمەندی لەقەناعەتە.
- **٥٩٦- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: شەرمت بە خۆ نەبێ لەبەخشینی کەم، شەرمت بە خۆ بێ لەئەوە کە هەژار بە دەست بە تاڵی ڕەوان بکەیتەوە.
- **٥٩٧- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر پێت خۆشە لەگەڵ

خاوەن ڕێزان بانگ بکرێی، ئەوا خۆت لەنارەوا دووربکەوە.

- **٥٩٨- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر هۆشی پیاو تەواو بوو، کەم قسە دەکات.
- **٥٩٩- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: گەورەترین تاوان لەلای خودا، زمانی درۆگۆیە.
- **٦٠٠- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: دۆستی پیاو سێ کەسە: دۆستی خۆت. دۆستی دۆستت. دۆستی دوژمنت. دوژمنەکانیش سێ کەسە: دوژمنی خۆت. دوژمنی دۆستت. دوژمنی دۆستت.
- **٦٠١- ئامۆژگاری عەلی بن ئەبی تالب. دەگێڕنەوە:** گوتی: گەورترین کار فەرمان بە چاکەو جلەو گیری لەخراپەو رِق لیّ بوونەوە لەپیاوی فاسقە.
- **٦٠٢- ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە:** گوتی: چوار شت کە سەیری دەکەی خێرە، بەلاّم لەناوەرِۆکیدا فەرزە، قورئان خوێندن خێرە، کار پیّ کردنی فەرزە، سەردانی گۆرِ خێرە خۆ بۆ ئامادەکردنی فەرزە، چوونە لای نەخۆش خێرە، وەسیەت پیّ کردنی فەرزە، دۆستایەتی چاکان خێرە، ئیقتیدا پیّ کردنیان فەرزە.
- **٦٠٣- ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە:** گوتی: تامی باوەرِ لەچوار شتە: جیّ بەجیّ کردنی فەرزەکانو خۆپاراستن لەنارەواکانو فەرمان بە چاکەو جلەو گیرِی لەخراپە.
- **٦٠٤- ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە:** کەسێك جیهانی نەویّ، خودا خۆشی دەویّ، تاوانی نەویّ، فریشتە خۆشی دەویّ. تەماعی لەسامانی موسڵمانان نەبیّ، ئەوان خۆشیان دەویّ.
- **٦٠٥- ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە:** گوتی: خەم لە جیهان تاریکیە بۆ دڵ، خەم لەدوارِۆژ رِوناکیە بۆ دڵ.
- **٦٠٦- ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر من لەنێوانی دۆزەخو بەهەشت دابم، نەزانم بۆ کامەیان دەچم، پێم خۆشە گڵ بوومایە.

- ٦٠٧- **ئامۆژگاری عوسمانی عەفان: دەگێڕنەوە: گوتی:** ئەگەردڵ پاگژ بوایە، ئێمە لەقورئان تێر نەدەبووین.
- ٦٠٨- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: پێم خۆشە من موێلك بوام لەجەستەی بەندەیەکی باوەڕدار.
- ٦٠٩- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: هیچ شتێ ناخۆشتر نییە. لەجیابونەوە لەدۆستان.
- ٦١٠- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەموو دەرونێ حەزی هەیە، جا ئەگەر رێی بدەن ئەوە بەڕەڵلا دەبێ.
- ٦١١- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: جگە لەخودا ئومێدت بە کەس نەبێ. جگە لەتاوان ترست لەهیچ نەبێ.
- ٦١٢- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەکەی بێز لەموسڵمانان بکەیتەوە: چونکە بچوکیش بێ لەلای خودا گەورەیە.
- ٦١٣- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداو: دەگێڕنەوە:** گوتی: هەژاریم خۆش دەوێ لەبەر خودا، نەخۆشیم خۆش دەوێ لەبەر ڕەش بوونەوەی تاوان، مەرگم خۆش دەوێ، چونکە بە خودا دەگەم.
- ٦١٤- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: خودا هەروەك دەرەوەتی لێ دیارە، ناوەوەشتی لێ دیارە.
- ٦١٥- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەی خەڵکینە: بڕۆن ئاگری دۆزەختان بە نوێژ بکوژێننەوە.
- ٦١٦- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** پیاوێ گوتی: من جنێوێکت پێ دەدەم لەگەڵت بێتە نێو گۆڕ. گوتی: لەگەڵ خۆت دێتە نێو گۆڕ!.
- ٦١٧- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك نهێنی یەکانی خۆی بشارێتەوە، چاکە لەنێو دەستیەتی.
- ٦١٨- **ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: لوت بەرز مەبن، چونکە لەخۆڵ دروست

کراون، دەگەڕێنەوە نێو خۆڵ.

- **٦١٩- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر پێیەکم لەبەهەشت بێ، ئەوی تر لەدەرەوەی بەهەشت، هێشتا لەخۆم ئاسایش نابم کە خودا دەمباتە بەهەشت.
- **٦٢٠- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: لەسەر مەرگ ڕشت بە. خودا ژیانت پێ دەبەخشێ.
- **٦٢١- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك ئەم چوار ڕەوشتەی هەبێ، چاکترین بەندەی خودایە: بەتەوبە دڵشاد بێ. نزای لێ خۆشبون بۆ بەدکار بکات. بانگی هەلاتوو بکات لەغەزا. یارمەتی چاکەکار بدات.
- **٦٢٢- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: چوار شت بە چوار شت تەواو دەبێ. نوێژ بە کڕنۆشی هەڵە (سجدة السهو)، ڕۆژو بە زەکاتو سەرفترە، حەج بە خوێن ڕشتن (قوربانی)، باوەڕ بە جیهاد.
- **٦٢٣- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: خۆت چاك بکە خەڵك بۆت چاك دەبن.
- **٦٢٤- ئامۆژگاری ئەبوبەکر. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر چاکەیەکت لەدەست چوو فریای بکەوە، ئەگەر خراپەیەکت بۆ هات پێشی لێ بگرە.
- **٦٢٥- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر چویتە ماڵێ: خاوەن ماڵ ئامازەی چ شوێنێکی بۆ کردی، لەوێ دابنیشە.
- **٦٢٦- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی: دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاو هەیە قسەیەك دەکات، دانیشتوان بە قسەکەی پێ دەکەنو قسەکەی ناشەرعیە، سزای خودا هەموویان دەگرێتەوە. پیاویش هەیە قسەیەك دەکات قسەکە شەرعیە، بەخشندەی خودا هەموویان دەگرێتەوە.
- **٦٢٧- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی:** دەگێڕنەوە: گوتی: خەڵکی لەپێش ئێوە بە سێ شت لەنێو چوون: زۆر گوتن، زۆر خواردن، زۆر نوستن.
- **٦٢٨- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی:** دەگێڕنەوە: گوتی: یەکێ لەنیشانەکانی نزیك بوونی

جیهان وێران بوون، گوێڕایەڵی ژنانە.

- **٦٢٩- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی:** دەگێڕنەوە: گوتی: نەکەی یەکێك تاوانی کرد، پشتی لێ بکەی، چونکە بەڵکو لەپاش کەمێ بگەڕێتەوە.
- **٦٣٠- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی:** دەگێڕنەوە: گوتی: خەڵك بە دووشت لەنێو چوون زۆر گوتن و سامانی زۆر.
- **٦٣١- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی:** دەگێڕنەوە: گوتی: ئێوە کە پرسیاری گەمەی شەترەنجم لێ دەکەن. ئەو گەمەیە نەفرەت لێ کراوە.
- **٦٣٢- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە نزای کرد. با لەسەرەتادا نزا بۆ خۆی بکات، چونکە نازانێ چ نزایەك گیرا دەبێ.
- **٦٣٣- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی: دەگێڕنەوە:** گوتی: یەکێك داوای زانستێ بکات لەبەر ڕەزامەندی خودا، ئەوە خودا شتێکی لەزانستەکە پێ دەدات کە بەسی بێ.
- **٦٣٤- ئامۆژگاری ئیبراهیمی نخعی: دەگێڕنەوە:** گوتی: لەپاش باوەڕ، هیچ شتێ وەك ئارامی لەسەر ئازار چاکتر نییە.
- **٦٣٥- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: لەهەموو شتێ پتر لێی بترسێم ئەوەیە، خودا بڵێ دەتزانی، چ کارێکت بە زانینەکەت کردووە؟.
- **٦٣٦- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء : دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر یادی مردنت کردەوە. خۆت بە مردوو دابنێ.
- **٦٣٧- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: بەڕاستی خەڵکان لەسەر چ باوەڕێ مرد بن لەسەر ئەو زیندوو دەبنەوە. زانا لەسەر زاناییەکەی. نەزان لەسەر نەزانینەکەی.
- **٦٣٨- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: بیرکردنەوەی کاتێ لەخودا چل شەو، لەخودا پەرستی چاکترە.
- **٦٣٩- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی نەفام سێ شتە: لووت بەرزی، زۆر گوتن، کارێ قەدەغە بکات، خۆیشی بیکات.
- **٦٤٠- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر باسێکی ئایین فێر ببم، پێم

لەشەو نوێژێ چاکترە.

- **٦٤١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: من هەفتا پیاوی چاکم دیوە، جگە لەجلی بەریان چیتریان نەبووە، کاتێ دادەنیشتن ڕایەخیان ڕانەدەخست.
- **٦٤٢- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر خودا کەسێکی خۆش بوێت، خەریکی ناکات بە منداڵو سامان.
- **٦٤٣- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر دەتەوێ باسی کەمو کورپەکی کەسێ بکەیت، لەسەرەتادا سەیری کەمو کورپی خۆت بکە.
- **٦٤٤- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی نا بەختیاری، منداڵی زۆر، کەم سامانی، هاوسێی خراپ، ژنی گزیکارە.
- **٦٤٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك دەروونی خۆی لەدەست دا بێ لەکاتی پێ خۆشبوونو، ئارەزوو، تورەیی خودا نایباتە دۆزەخ.
- **٦٤٦- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئیسلام ئەوەیە دڵ بۆ خودا مل کەچ بێ، خەڵکان لێت ئاسایش بن.
- **٦٤٧- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر دەتانزانی لەپاش مەرگ چەندە ناخۆشی هەیە، خواردنو خواردنەوەتان نەدەخواردو خۆزگەتان بە درەخت دەبرد.
- **٦٤٨- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: هیچ پارچەیەك نییە لەجەستەی موسڵمان لەزمان خۆشەویستربێ لەلای خودا، هیچ پارچەیەکیش نییە لەجەستەی کافر لەزمان خراپتر بێ لەلای خودا.
- **٦٤٩- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاو نابێتە زانا، تا هەمیشە بە دوای زانست نەگەڕێو کاریان پێ نەکات.
- **٦٥٠- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: یەك جار قوڕبەسەری ئەو کەسەی کە نازانێ، هەفت جار قوڕبەسەری کەسێك کە دەزانیو کاری پێ ناکات.
- **٦٥١- ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای گوتی: ئامۆژگاریم بکە؟ گوتی: لەکاتی خۆشی یادی خودا بکە، لەکاتی ناخۆشی بەهاناتەوە دێ.

- ٦٥٢- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: دوو ڕەکات نوێژ بکە لەتاریکی شەو، بۆ تاریکی گۆڕ.
- ٦٥٣- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر کەسێ: لەکاتی چوونە سەرخەوگای نیازی شەو نوێژی هەبوو، بەڵام خەوی لێ کەوت، ئەوا خودا پاداشی شەو نوێژی بۆ دەنوسێ.
- ٦٥٤- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر (١٠٠) جار بڵێم الله اکبر پێم چاکترە لەکردنە خێری ١٠٠ مسقاڵ زێڕ.
- ٦٥٥- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك یادی مەرگ بکات دلشادی کەم دەبێ‌و لەچەری نابێ.
- ٦٥٦- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: سکاڵای گرفتی مەکەو باسی ئازارت مەکەو بە خۆت خۆت هەڵ مەکێشە.
- ٦٥٧- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: خۆتان لەنزای ستەم لێ کراوو هەتیو بپارێزن. چونکە خەڵك لەخەو دانە، نزای ئەوان دەچێتە بارەگای خودا.
- ٦٥٨- **ئامۆژگاری ئەبو الدرداء: دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی زانایی پیاو ئەوەیە: چوون‌و هاتن‌و ڕۆیشتنی لەگەڵ زانایان بێ.
- ٦٥٩- **ئامۆژگاری ئەبو ذر، دەگێڕنەوە:** گوتی: ئایا پێتان نەڵێم لە چ ڕۆژێ من هەژارم، لەو ڕۆژەی کە دەم خەنە نێو گۆڕ.
- ٦٦٠- **ئامۆژگاری ئەبو ذر، دەگێڕنەوە:** گوتی: نوێژ کۆڵەگەی ئاینەو جیهاد پۆپەی کاری چاکەو خێر گرنگە. خێر گرنگە. خێر گرنگە.
- ٦٦١- **ئامۆژگاری ئەبو ذر، دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای‌و گوتی: کێ لەخۆشیدایە؟ گوتی: پیاوێ لەنێو گۆڕ ئازار نەدرێ، چاوەڕێ ی بەهەشت بێ.
- ٦٦٢- **ئامۆژگاری ئەبو ذر دەگێڕنەوە:** گوتی: سپاردە بدەنەوە، گوتیان سپاردە چی یە؟ گوتی: خۆ شۆردن لەلەش پیسی.
- ٦٦٣- **ئامۆژگاری ئەبو ذر دەگێڕنەوە: گوتی:** سامانەکەت بکە دوو بەش: بەشێك بۆ خاوو

خێزانت، بەشێ: بۆ خێر، بەشی سێهەم زیانی بۆت هەیە، نەك قازانج.

- **٦٦٤- ئامۆژگاری ئەبو ذر دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لایو گوتی: ئەوە بۆ دەچیە هەر کۆڕێ خەڵك دەڕوات؟ گوتی: چونکە دەڵێم پارە هەڵ مەگرن.
- **٦٦٥- ئامۆژگاری ئەبو هریرە دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر گوێچکەتان پڕ بێ لەمسی تواوە، چاکترە، نەك گوێتان لەبانگی نوێژ بێو نەچنە نوێژەکە
- **٦٦٦- ئامۆژگاری ئەبو هریرە دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەم سێ شتە خراپە: چوونە لای پادشا، کۆکردنەوەی سامان، خۆشەویستی پلەو پایە.
- **٦٦٧- ئامۆژگاری ئەبو هریرە دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر خۆڵ بخۆن چاکترە، نەك سامانی ناڕەوا بخۆن.
- **٦٦٨- ئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەبو هریرە دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: لەپێش ئەوەی دەخەوی نوێژی تاك (وتر) بکە، لەڕۆژی هەینی خۆت بشۆ، لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە.
- **٦٦٩- ئامۆژگاری ئەبو هریرە دەگێڕنەوە:**گوتی:نەخۆشی تێکەڵ بە ناووشورەتوڕیایی نابێت.
- **٦٧٠- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** گوتی ئەگەر شەڕو خراپەت دیت پشتیان تێ بکە، وازت لێ دەهێنن. تۆش وازیان لێ بهێنە.
- **٦٧١- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** گوتی سەرم سوڕماوە لەئەو کەسەی کە لووتی بەرزە، کەچی دووجار بە کونی میزدا هاتۆتە دەر!
- **٦٧٢- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** من دوو ڕەوشتم هەیە ناوی کەسێك ناهێنم کە لەکۆڕی من دابنیشێ، چ کارم بە کارێ هەیە کە پرسم پێ نەکەن.
- **٦٧٣- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای گوتی: فێرە نەرمو نیانیم بکە؟ گوتی: ئارام دەبێ ئەگەر ڕیسوا بی.
- **٦٧٤- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** گوتیان پیاوەتی چی یە؟ گوتی: ئەوەیە کە هەر کارێ بکەی بە پەنهانی، شەرمت پێ نەبێ لەکاتی ئاشکرایی.
- **٦٧٥- ئامۆژگاری ئەحنەف دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاوەتی لەلای درۆزن نییەو، گەورێتی

لەلای ڕژد نیە، وەرع لەلای ڕووگرژ نییە.

- ٦٧٦- **ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی گیرابوونی کاری چاك ئەوەیە: ئەدەبت هەبێ.
- ٦٧٧- **ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە:** گوتی: زۆر قورئان خوێن هەیە، قورئانەکە نەفرەتی لێ دەکا. ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە: گوتی: هەر ماڵێ میوانی نەبێ، فریشتەش ناچێتە ئەو ماڵە.
- ٦٧٨- **ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە:** گوتی: هیچ شتێ لەلای خودا خۆشەویست نییە وەك گەنجی تەوبەکار.
- ٦٧٩- **ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك لەڕاهی خودا بانگ بداو، لەڕۆژی دوایی کە دەچێتە بەهەشت پێی دەڵێن: تکا بۆ کێ دەکەی بیکە.
- ٦٨٠- **ئامۆژگاری ئەنەسی مالیك. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك مەسرەتی لەنێوان دوو کەس بکات، چەند وشەی لەزار دەربچێ، هەر وشەیەك بە ئەندازەی بەندەیەك ئازاد بکەی پاداشتی هەیە.
- ٦٨١- **ئامۆژگاری وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** گوتی: نزا بۆ یەکێك بکەی بە نهێنی، چاکترە لەئەوەی کە بچیتە سەر دانی، چونکە وا دەبێ سەردان ریایی بکەوێتە ناو.
- ٦٨٢- **ئامۆژگاری وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لایەو گوتی: ئامۆژگاریم بکە؟ گوتی: بۆ لای خودا رابکە. کابرا گوتی: ئەی ڕۆزیم. ئەوەیس گوتی: ئایینەکەت دەبەیتە لای خودا گومانت نییە، گومانت لەڕۆزییە!
- ٦٨٣- **ئامۆژگاری وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** گوتی: نەم دیوە کەسێك خودا بناسی، بەیەکێکی تر هۆگر بێ.
- ٦٨٤- **ئامۆژگاری وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** گوتی: خۆت بە چەشنێ دابنێ بەرابەر خودا وەك کابرایەك کە هەموو خەڵکی کوشتووەو خەمدارە.
- ٦٨٥- **ئامۆژگاری وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر بە ئەندازەی خەلکی ئاسمانو زەوی خودا پەرستی بکەی خودا لێت گیرای ناکات، تا بە دڵسۆزی ئەنجامی نەدەی.

- **٦٨٦- ئامۆژگاری حزیفەی یەمانی. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لایو گوتی: مـن لـەمونافیقی دەترسم. گوتی: ئەگەر بترسی چۆن مونافیقی؟
- **٦٨٧- ئامۆژگاری حزیفەی یەمانی. دەگێڕنەوە:** گـوتی: نەکـەن بـچنە دەرگـەی فرتێنـە؟ گوتیان: دەرگەی فرتێنە چی یە؟ گوتی: چـوونە لای کاربەدەسـت، کـە قـسەیەك درۆ بـێ بڵێی: ڕاستە. قسەیەك بکەیت کە ڕەوشتی ئەو نەبێ.
- **٦٨٨- ئامۆژگـاری حزیفـەی یـەمانی. دەگێڕنـەوە:** جـارێ پیـاوێکی نوێژکـەری دیـت، نوێژەکەی جوان نەدەکرد. گوتی: ئەگـەر لەسـەر ئـەم شـێوازە بمـری لەسـەر ئیـسلامەتی نامریت.
- **٦٨٩- ئامۆژگاری حزیفەی یەمانی. دەگێڕنەوە:** گوتی: چەرخێك بە سەر ئەم گەلە دادێ، ئەگەر وەك مەلەوان ناو ئاودا نەپەڕێنەوە، خودا ڕزگارتان ناکات.
- **٦٩٠- ئامۆژگاری حزیفەی یەمانی. دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاو ئـەو کەسـە نیـە کـە جیهـانی بەرداوە، دوا ڕۆژی دەوێ. یا دوا ڕۆژی بەرداوە جیهانی دەوێ، پیاو ئەوەیە کـە هـەر دوو لای بوێت.
- **٦٩١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گـوتی: ئـەو کەسـەی پارێزگـاری زمـانی نەکات، ئایینەکەی نەبەستراوەتەوە.
- **٦٩٢- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەر شتێ خودا ناردیە سەر بەندەی لەخۆشیو ناخۆشی ئەوە بۆ خۆی چاکە.
- **٦٩٣- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: لەسەر ڕووی زەوی نوسراوە هەر کەسێك جیهانی خۆش بوێت ڕقی لەخودایـە، ئەگـەر ڕقـی لـەجیهان بـوو خـودا خۆشـی دەوێت.
- **٦٩٤- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەرکەسێ لـەکاتی گـەنجی خـودا بناسێ، لەکاتی پیری ژیر دەبێ.
- **٦٩٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنـەوە:** گـوتی: هـەر کەسـێك لـەخودا بترسـێ هەموو شتێ لێی دەترسێ. ئەگەر لەخوداش نەترسێ خودا، لەهەموو شتێ دەیترسێنێ.

- **٦٩٦- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێ قسە زۆر بکا درۆی زۆرە. سامانی زۆر بێ، تاوانی زۆرە. رەفتاری خراپ بێ. خۆی ئازار داوە.
- **٦٩٧- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك ئەدەبی نەبێ زانستی نییە. ئارامی نەبێ، ئایینی نییە، وەرعی نەبێ دوارۆژی نییە.
- **٦٩٨- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەموو گەلێك بتێکی هەبووە. بتی ئۆمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دینارو درهەمە.
- **٦٩٩- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر خودا حەزی لێ بێ هەمووتان دەوڵەمەند دەکات، بەڵام تاقیتان دەکاتەوە.
- **٧٠٠- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر هۆش بە نرخ بوایە زۆر گران دەبوو، بەڵام سەیرە ئەوانەی بەپارە خۆیان سەرخۆش دەکەن؟
- **٧٠١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر بزانم کولێرەیەك بە پارەی رەوا دەست کەوتووە دەیسوتێنم، لەپاشاندا وردی دەکەم. ئینجا دەیکەمە دەرمانی نەخۆشان.
- **٧٠٢- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هاوسێی چاك ئەوە نییە ئازاری هاوسێی نەدات. بەڵکو ئەوەیە: کە لەسەر ئازاری ئەو ئارام بگرێ.
- **٧٠٣- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەرکەسێ ئاواتی درێژ بێ کارو کردەوەی خراپ دەبێ.
- **٧٠٤- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هیچ کەسێك خودا پەرستی نەکردوە وەك ئەوەی کە وازی لەقەدەغەکراوەکانی خودای هێناوە.
- **٧٠٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: خراپترین کەس بۆ مردوو ماڵی خۆیەتی، گرین و زاری بۆ دەکەن، بەڵام قەردی بۆ نادەنەوە.
- **٧٠٦- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئارامی گەنجینەیەکە لەگەنجینەکانی بەهەشت. بەندەیەك لەلای خودا رێزی نەبێ خودا پێی نادات.
- **٧٠٧- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: زانست دووبەشە: بەشێکی لەدڵدایە ئەوە چاکە، ئەویتر لەزماندایە ئەوە بەڵگەی خودایە لەسەر بەندەکان.

- **٧٠٨- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای گوتی: من دڵم ڕەقە، گوتی: زۆر لەکۆڕی زکران دابنیشە.
- **٧٠٩- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتیان جیهان چۆنە؟ گوتی: لەبەر ناخۆشیەکانی خۆشیەکانم لەبیر چۆتەوە.
- **٧١٠- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتیان حەجی ڕەوا چی یە؟ گوتی: زوهدت لەجیهاندا هەبێو چاوت لەدوارۆژ بێ.
- **٧١١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەر نوێژێ ترسی لەگەڵدا نەبێ سزای لەدوادایە.
- **٧١٢- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ڕاتان دەسپێرم کە یادی خودا بکەنو لێی بترسن. سەرچاوەی هەموو کارێ بیرکردنەوەیە.
- **٧١٣- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ناو هێنانی سێ کەس غەیبەت نییە پیاوی خراپ، پیاوی فاسق، پادشای زۆردار.
- **٧١٤- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەو کەسەی یادی خودا دەکات لەدوارۆژدا وەك خۆر تیشك دارەو وەك مانگ بەڵگە دارە.
- **٧١٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: ناو هێنانی خەڵك بە ئاشکرا ستایش کردنیەتی.
- **٧١٦- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: تاوان لەسەر تاوان دڵی مرۆڤ ڕەش دەکات.
- **٧١٧- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێکی لەسەر گۆڕستان دیت خواردنی دەخوارد گوتی: ئەوە مونافیقە، چونکە مەرگ لەنێو چەوانیەتی خۆراك دەخوات.
- **٧١٨- ئامۆژگاری حزیفە. دەگێڕنەوە.** گوتی: هەموو بەیانیانو ئێواران بانگکەرێ دەڵێ: ئەی مرۆڤ کۆچبکەن! کۆچبکەن!
- **٧١٩- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: گەورەترین جیهاد جیهادی ئارەزووە.

- **٧٢٠- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: گەورەترین کەس لەڕۆژی دوایی کە پاداشتی هەیە موسڵمانی تەمەن درێژە.
- **٧٢١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: زۆر (استغفر الله) بکەن لەبازێڕو گەڕەكو ماڵو سەرنانو خۆراك، چونکە نازانن خودا لەکێ لێتان خۆش دەبێ.
- **٧٢٢- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: وا دەبێ لەبەر بوونی تاوانێ، پیاو لەشەو نوێژ جیادەبێتەوە.
- **٧٢٣- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: هاوەڵی خراپ تووشی مەزەندەی خراپت دەکات.
- **٧٢٤- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: یەکێك لەگزیکردن ئەوەیە: نهێنی دۆستانت ئاشکرا بکەی.
- **٧٢٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: نیفاقی ئەوەیە زمانتو دڵو ناوەوەو دەرەوەو چوونو هاتنت جیا بێ.
- **٧٢٦- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاوی نەرم لەکاتی تورەیی دەناسرێ. تا تورە نەبێ نازانی نەرمە.
- **٧٢٧- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك لەبەر بێ فیزی بەرگی خوری لەبەر بکات. ئەوا خودا ڕوناکی چاوو دڵی زۆر دەکات. ئەگەر بۆ فیز پۆشی ئەوە لەدۆزەخ سووری دەکاتەوە.
- **٧٢٨- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك قسەی خەڵك بۆتۆ بهێنێ، قسەی تۆش بۆ ئەوان دەبات.
- **٧٢٩- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: خەڵك لە دوارۆژدا هەر کاتێ حەز بکەن سەیری خودا دەکەن.
- **٧٣٠- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: سوێندم بە خودا هەر کەسێك پارەی لەلا گەورە بێ، خودا بچوکی دەکات.
- **٧٣١- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاو دەبێتە زانا، نابێتە

خوداپەرست. خودا پەرست دەبێ بەڵام وادەبێ هۆشیار نییە.

- ٧٣٢- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: سێ کەس میوانی خودان: ئەوەی دەچێتە مزگەوت، ئەوەی دەچێتە سەردانی دۆستی، ئەوەی دەچێتە حەج. بە مەرجێ نیازیان خودا بێ.
- ٧٣٣- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: مرۆڤ بە سێ کەسەرەوە دەمرێت، یەکەم: لەسامان کۆکردنەوە تێر ناخوات، هەموو هیوایەکی نایەتە دی، ئەنجامی نازانێت تا دەمرێت.
- ٧٣٤- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: چوونە مزگەوت بە هەمیشەیی ئەم سوودانەی هدیە: دەست کەوتنی دۆستی چاك، دابەزینی بەخشندەی خوداو زانستی بەسورد، قسەی چاكو دووركەوتنەوە لەخراپە، دووركەوتنەوە لەتاوان لەترسی خودا.
- ٧٣٥- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: ئەگەر گەورێتی بەبێ هۆزت دەوێ، سامی بێ چەکت لەتاوان دەوێ برۆ بۆ خوا پەرستی.
- ٧٣٦- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: سوێند بەخودا، دیومە ئەوانەی کەوتنە دوو دوارۆژ، جیهانیان دەست کەوت. بەڵام ئەوانەی کەوتنە دوو جیهان، دوا رۆژیان دەست نەکەوت.
- ٧٣٧- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: ڕووگرژی لەگرفت سەختترە.
- ٧٣٨- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: شۆردنی دەست لەپێش نان خواردن هەژاری لا دەبات، لەپاش نان خواردن خەم لادەبات.
- ٧٣٩-٩٩٥- **پێشەوا عومەرو دۆزەخ. دەگێڕنەوە:** دەیگوت: دۆزەخ گەرمیەکەت سەختە. دوورو قوڵی. پێی لەئاسنی سۆرکراوەیە.
- ٧٤٠- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: لەرۆژی دوایی بانگکەرێ بانگ دەکات هەرکەسێك پاداشتی لەلای خودایە، باوەری بگرێتەوە. تەنها چاکە کاران هەڵدەسنەوە.
- ٧٤١- **ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: رژد ئەو کەسەیە لەسڵاو کردن

ڕژده.

- **٧٤٢- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: گریان لەترسی خودا، لەدۆزەخت ڕزگار دەکات.
- **٧٤٣- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: لەئایین شارەزابن، وەك عەرەبە نەخوێندەوارەکان مەبن.
- **٧٤٤- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: پێنج شت گرنگە: هۆش، ئاین، ئەدەب، شەرمو ڕووخۆشی.
- **٧٤٥- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: خراپترین پاشا ئەوەیە ترسنۆك بێ، ڕژد بێ، بەرامبەر ڕەشو ڕووتان دڵ ڕەق بێ.
- **٧٤٦- ئامۆژگاری حوسێنی عەلی. دەگێڕنەوە:** گوتی: لەپێنج شت، شەیتان ناتوانێ فێڵ لەمرۆڤ بکات:

١- لەگەڵ خودای خۆی ڕاست بێ.

٢- زۆر یادی خوا بکات.

٣- چی بۆ خۆی پێ خۆشە، ئەوەشی بۆ موسڵمان پێ خۆشیێ.

٤- ناڵەو شین نەکات لەکاتی گرفت.

٥- بەبەشی خۆی ڕازی بێ.

- **٧٤٧- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: سڵاو کردن هەفتا پاداشتی هەیە، یەکێك لەو هەفتایە بۆ کابرای سڵاو لێ کراوە.
- **٧٤٨- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: مەرگی بە ئازادی، چاکترە لەمەرگی ریسوایی.
- **٧٤٩- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: ئەی مرۆڤ تۆ رۆژێ هەندێك لەڕۆژەکە بڕوا، لەتۆ ڕۆیشتوە.
- **٧٥٠- ئامۆژگاری حەسەنی عەلی: دەگێڕنەوە.** گوتی: کەسێك سورەتی القدر لەنوێژێکی

فەرز بخوێنێ، بانگکەرێ بانگ دەکات ئەی بەندەی خودا، خودا لەتاوانەکانت خۆشبووە، جا کاری چاك بکە.

- **٧٥١- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە: گوتی:** ئەو کەسانەی کە سوپاسی خودایان کردووە، لەخۆشیو لەناخۆشی دەچنە بەهەشت.
- **٧٥٢- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی گیرابوونی نزا، کردنی نزایە بەشیرینی.
- **٧٥٣- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە:** گوتی: لەجیهاندا خەم لە هیچ شت ناخۆم. تەنها لەسوژدە ئەگەر نەم بردبێ.
- **٧٥٤- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە:**لێیان پرسی کێ خوداناسە؟ گوتی: ئەوەی بیر لەتاوانی خۆی بکاتەوە، بێزی لەخۆی بیێتەوە.
- **٧٥٥- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە:** گوتی: بەفیڕۆدانی سامان ئەوەیە لەتاوانی خەرج بکەی.
- **٧٥٦- ئامۆژگاری سەعید جبیر. دەگێڕنەوە:** گوتی: پشت بەستن بە خودا کۆی باوەڕە.
- **٧٥٧- ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:**گوتی: تاوان دەردە، زانا دەرمانە، ئەگەر زانا خۆی خراپ بوو، دەرمان لەکێ یە!؟
- **٧٥٨- ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:**گوتی: جیهان بۆ جەستە، دواڕۆژ بۆ دڵ.
- **٧٥٩- ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:**گوتی: قەرد بۆ شەو خەمە، بۆ رۆژ ریسواییە، ئەگەر خودا یەکێ ڕیسوا بکات دەیکاتە خەناوکە لەملی.
- **٧٦٠- ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** گریان ١٠ بەشە ٩ی بۆ دنیایە. یەکێکی بۆ خودایە، ئەوەی بۆ خودایە، ئەگەر ساڵێ جارێ بێ زۆرە.
- **٧٦١- ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** بیدعە لەلای شەیتان خۆشەویسترە لەتاوان، چونکە تاوان تۆبەی هەیە، بەڵام بیدعە تۆبەی نییە.
- **٧٦٢- ئامۆژگاری سفیانی پوری. دەگێڕنەوە:** ئەگەر یەکێ: لەئێوە گوێی لەبیدعەیەك بوو، با بڵاوی نەکاتەوە.

- **٧٦٣- ئامۆژگاری سەلمانی فارسی. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر دەتوانی خۆڵ بخۆ، بەڵام مەبە گەورەی دوو کەس.
- **٧٦٤- ئامۆژگاری سەلمانی فارسی. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەو زانایەی ئامۆژگاری خەڵك ناکات، وەك گەنجینەیەکە خێری لێ نەکرێ.
- **٧٦٥- پیاو چاکێك و دڵ: دەگێڕنەوە:** پیاو چاکێك فەرموویەتی: ئەگەر پێم بڵێن عەجیب ترین شت لای تۆ چییە؟ دەڵێم: دڵێ کە خوا بناسێ، لەپاشاندا تاوان بکا.
- **٧٦٦- ئامۆژگاری تاوس. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لایو گوتی: نزامان بۆ بکە؟ گوتی: ترسێ لەدڵم دانییە کە نزای پێ بکەم.
- **٧٦٧- ئامۆژگاری تاوس. دەگێڕنەوە:** گوتی: خودا پەرستی گەنج تەواو نابێ، تا ژن نەهێنێ.
- **٧٦٨- ئامۆژگاری تاوس. دەگێڕنەوە:** گوتی: شیرینی جیهان تاڵی دوارۆژە، تاڵی دنیا شرینی دوارۆژە.
- **٧٦٩- ئامۆژگاری عائیشە. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئێوە لەخودا پەرستیەك بێ ئاگان کە مل کەچی یە.
- **٧٧٠- ئامۆژگاری عائیشە. دەگێڕنەوە:** گوتی: یەکەم بیدعە کە لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) ڕویدا تێر خواردن بوو.
- **٧٧١- ئامۆژگاری عائیشە. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر شەوی قەدر ببینم تەنها داوای لێ خۆشبوون دەکەم لەخودا.
- **٧٧٢- ئامۆژگاری عائیشە. دەگێڕنەوە:** گوتی: بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی کە (استغفر الله) لەنێو پەڕاوی زۆرە.
- **٧٧٣- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: چوار شت قازانجە راست گۆیی، شەرم، ڕووخۆشی، سوپاسگوزاری خودا.
- **٧٧٤- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: تاوانی بچووك ئەوەیە بە خەڵك بگرژیەوە. تاوانی گەورەش پێی پێ بکەنی.
- **٧٧٥- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر پیاو واز لەنێر بازی

نەهێنێ، لەگۆڕەکەی دەبێتە بەراز.

- ٧٧٦- **ئامۆژگاری عەبدوڵڵای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: گەورێتی لەجیهاندا بە خێرکردنە، لەدوارۆژ بە تەقوایە.
- ٧٧٧- **ئامۆژگاری عەبدوڵڵای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: هۆش لەئەدەب چاکترە، چونکە هۆش لەخوداوەیە، بەڵام ئەدەب بەندە کۆی کردۆتەوە.
- ٧٧٨- **ئامۆژگاری عەبدوڵڵای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: خانوی بەهەشت بە ئەندازەی ئەستێرەی ئاسمانە، زێیەکانی بە ئەندازەی ئاسمانە، زێیەك هەیە لەبەهەشت بە ناوی زێ ی ڕەحمەت بە نێو هەموو بەهەشت دادەچێ.
- ٧٧٩- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** دەیگوت من زۆر دڵشادم بەشەو، چونکە چاوم بە کەس ناکەوێت.
- ٧٨٠- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** ڕۆژێ دادێ بەسەر خەڵك جەستە زیندوەو دڵیش مردوو.
- ٧٨١- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** گوتی: پێم خۆشە تیرێ لەپیاوێ بدەم، نەك قسەیەکی پێ بڵێم.
- ٧٨٢- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** سەیری سەرو سیمای خەڵکی بازێڕ مەکەن، چونکە دڵیان گورگە.
- ٧٨٣- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەو پیاوەی کە دەیەوێ شارەزابێ لەزانستی ئایین، لەسەرەتادا با لەماوەی ٢٠ ساڵ خۆی فێرە ئاداب بکات.
- ٧٨٤- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە:** گوتی: کەسێك بیری مەرگ بکاتەوە گۆڕەکەی بۆی دەبێتە باخ. ئەگەر بیری لێ نەکاتەوە بۆی دەبێتە چاڵی دۆزەخ.
- ٧٨٥- **ئامۆژگاری سفیانی ثوري. دەگێڕنەوە: گوتی:** کەسێك دەروونی خۆی بناسێ، بە قسەی خەڵك تێك ناچێ، کە قسەی پێ بڵێن.
- ٧٨٦- **ئامۆژگاری عەبدوڵڵای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: زانستو سامان کەمو کوڕی

خاوەنەکەی دەشارنەوە، بەڵام هەژاری‌و نەفامی ئاشکرای دەکەن.

- **٧٨٧- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتیان: چۆن ئەوەندە زیرەکی؟ گوتی: بە هۆی زمانێکی بە پرسیارو دڵێکی هۆشیار.
- **٧٨٨- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتیان: کێت لەهەموو کەس خۆشتر دەوێت؟ گوتی: ئەو کەسەی لەتەکم دانیشتوە.
- **٧٨٩- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: کاری ناڕەوا ناخۆشترە لەگواستنەوەی کێو لەشوێنێ بۆ شوێنێکی تر.
- **٧٩٠- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: ئەگەر کەسێك یەك تاکە نوێژ نەکات، کە دەچێتە لای خودا، خودا لێی توڕەیە.
- **٧٩١- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عەباس. دەگێڕنەوە:** گوتی: خۆشەویسترین بەندە لەلای خودا، ئەو بەندەیە کە غەریبە.
- **٧٩٢- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: بەڕاستی کە لەهەموو کەسێك خودا پتر رقی لێ بێتەوە: پیاوی تانەچی‌و نەفرەت چی یە.
- **٧٩٣- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: چاکە کارێکی سانایە، ڕووخۆشی‌و قسە نەرمیە.
- **٧٩٤- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: نیشانەی ژنی دۆزەخی ئەوەیە، بەرامبەر پیاوی پێ دەکەنی‌و کە پیاوەکەی ڕۆیشت گزی لێ دەکات.
- **٧٩٥- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: فرمێسکێ بڕێژە بۆ خودا چاکترە لەکردنە خێری ١٠٠٠ دینار.
- **٧٩٦- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: هەموو بیدعەیەك گومڕایی یە، هەرچەندە خەڵك بە چاکی لەقەڵەم بدەن.
- **٧٩٧- ئامۆژگاری عەبدوڵلای عومەر. دەگێڕنەوە:** گوتی: پیاو هەر شتێکی لەدونیا دەست بکەوێت، پلەیەکی دوارۆژی پێی کەم دەبێ.
- **٧٩٨- عەبدوڵلای مەسعودو قورئان خوێندنی دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوت

قورئانم بۆ بخوێنە؟ ئەویش گوتی: قورئان بۆ تۆ هاتووتە خوار، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مـن پێم خۆشە گوێم لەخەڵك بێت، کاتێ خوێندی پێغەمبەر(ﷺ) دەگریا.

- **٧٩٩- سەودا خۆشی. دەگێڕنەوە:** جارێ حەسەنی بەصری ولآخێکی بـە چوارسـەد درهـەم فرۆشت لەکاتی پارە وەرگرتن کابرا گوتی: یا شێخ گـوتی: ١٠٠ درهـەم مـەدە. ئـەمجارە کابرا گوتی: یا شێخ. شێخ گوتی: قەیناکە ١٠٠ درهەمی تریش مەدە.
- **٨٠٠- ئامۆژگاری عەبدوڵلای مەسعود. دەگێڕنەوە:** گوتی: شەیتانی باوەڕدار لاوازە.
- **٨٠١- هاوبەشی بچوك. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن هاوبەشـی بـچوك چی یە؟ گوتیان: نەء پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕووپامایی (الرياء)!!
- **٨٠٢- کێ دڵسۆزە. دەگێڕنەوە:** لەزانایان فەرموویانە: دڵـسۆز ئـەو کەسـەیە: کـە چـاکەی دەشارێتەوە، هەروەك خراپەی دەشارێتەوە.
- **٨٠٣- سێ درۆزن. دەگێڕنەوە:** سێ کەس لـەلای خـودا دەسـت بـە قـسە دەکـەن، یەکـەم دەڵێت: من لەپێناوی تۆ شەهید بووم. خـودا دەفـەرمووێ: درۆ دەکـەی بـۆ نـاوو دەنـگ خۆت بە کوشتدا. دووهەم دەڵێ: من خێرم زۆر کردووە. دەڵێ: درۆ دەکەی بۆیە خێـرت دەکرد هەتا پێت بڵێن: خێرکەری. سێهەم دەڵێ: من ئامۆژگـاری خـەڵکم دەکـرد، خـودا دەفەرمووێ درۆدەکەی دەتویست بڵێن: زاناو زیرەکی. خودا پەنامان بدات. امین.
- **٨٠٤- فێڵ لەخودا مەکە. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ڕزگاری لەچی دایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فێڵ لەخودا مەکـە. گـوتی: چـۆن فێـڵ لـەخودا دەکـرێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوداو پێغەمبەر(ﷺ) کارێکیان داناوە تۆ بەنیازی بەریایی ئەنجامی بدەی.
- **٨٠٥- دیاری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عەرەبێ. دەگێڕنەوە:** جارێ عەرەبێ نوێژی دەکرد لـەپاش نوێژەکە گوتی: ئەی خودای کە چاو نات بینی. مەزەندە تێکەڵت نابێ.پێناسەی تۆ بـە کـێ دەکرێ؟ خۆت گرانی کێوەکانو ئەندازەی ئـاوی بـارانو پـشکی بـارانو گـەڵای دارانو تاریکی شەوو ڕوناکی ڕۆژ، هەرخۆت دەزانی دوا تەمەنم چاك بکەو دوا کـاتم چـاك بکـە، پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوێکی گوت برۆ بانگی بکە، کە هات پێغەمبـەر(ﷺ)گـوتی: تـۆ لـەچ

هۆزێکی؟ گوتی: هۆزی (سعسعه) هەندێ زێڕی پێدا گوتی: دەزانی بۆ ئەو زێڕەم پێدای؟ گوتی: چونکە خزمین. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: راستە، بەڵام نزاکانت زۆر جوان بوون.

- ٨٠٦- **ئامۆژگاری جنید. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: خودا ڕقی لەکەسێ دەبێتەوە نە کاری دونیا بکات، نە خودا پەرستی.
- ٨٠٧- **پێغەمبەر(ﷺ)و جویریەی خێزانی. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) جارێ لەڕۆژی هەینی چووە لای گوتی: بەڕۆژووی؟ جوەیریە گوتی: بەڵێ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دوێنێ پێ بووی گوتی: نەء. گوتی: ڕۆژی شەممە پێدەبی گوتی: نەء. پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: کەواتە ڕۆژووەکەت بشکێنە.
- ٨٠٨- **ئامۆژگاری ئیبن تیمیە. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: بە ڕاستی ئەگەر دڵ تامی باوەڕی کرد، خودا پەرستی بە دڵسۆزی کرد، هیچ لەلای ئەو لەو کارە چاکترو باشتر نییە.
- ٨٠٩- **ئامۆژگاری ئیبراهیمی وەلید. دەگێڕنەوە:** جارێ لەسەر پشتی ئەسپەکەی کەوتە خوار. قاچی شکا پیاوێ بۆ دڵدانەوە چووە لای گوتی: ئەگەر گرفتی دونیا نەبوایە، ئێمە بە موفلیسی دەچووینەوە بارەگای خودا.
- ٨١٠- **پێغەمبەر(ﷺ)و عوقبەی ابی معیطی تاوانبار.** دەگێڕنەوە: جارێك پێغەمبەری(ﷺ) داوەت کرد. پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: نانت ناخۆم. تاکو موسڵمان نەبی. عوقبە موسڵمان بوو. لەپاشاندا ئەو هەواڵەی بۆ امیەی خلفی تاوانبار گێڕایەوە کە دۆستی بوو. امیە گوتی: مادام تۆ موسڵمان بووی قسەت لەگەڵ ناکەم. تا تف لەپێغەمبەر نەکەیتو شتی پیسی پێدا نەدەیت. جا عوقبەی نەفام وای کرد. خودا فەرمووی ڕۆژێ دادێ، دەستی خۆی دەگەزێ.
- ٨١١- **ئامۆژگاری ئیبن عەباس. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ وتی: ئامۆژگاریم بکە؟ گوتی: تەقوای خودا بکەو لەسەر ئیسلامەتی بەردەوامبەو پەیڕەوی ئەمانە بکە. نەك بیدعە.
- ٨١٢- **ترسی نەبویەکر لەخودا. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی ئێمە هەفتا دەرگەمان جێ دەهێشت، لەترسی ئەوەی، نەوەك بکەوینە نێو حەرام.
- ٨١٣- **ئارامی لەکاتی سەرەتای گرفتە. دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر(ﷺ) بەلای ژنێ تێپەڕی. لەسەر گۆڕی کوڕەکەی دەگریا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئارام بە. ژنە نەیزانی

پێغەمبەرە گوتی: ئەوەی بە سەر من هاتووە بە سەر تۆ نەهاتووە. پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشت لەپاشا بە ژنەکەیان گوت ئەوە پێغەمبەرە. ژنەکە یەکسەر چووە مالّی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەمزانی تۆی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئارامی لەکاتی یەکەمە.

- **٨١٤- شێوە پێکەنینی پێغەمبەر(ﷺ). دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ)لەکاتی پێکەنین هەرگیز زمانی موبارەکی دەرنەکەوتوە. بەڵکو تەنها خەندەی لێوانی هەبوو. (ب.م).
- **٨١٥- کەراماتی ئەولیا. دەگێڕنەوە:** خودا لەفەرموودەی قودسی بە پێغەمبەری(ﷺ) راگەیاندووە، کەسێك بە گژ وەلی دابچێ، با بە گژ خودا دابچێ. بەندە بە ئەنجام دانی فەرزەکان. هەر لەخودا نزیك دەبێتەوە، تا لەسەر سوننەتەکان بەردەوام بێ. جا ئەگەر بەردەوام بوو دەبمە چاوی کە شت پێ دەبینێ. دەبمە گوێکەی کە شت پێ دەبیسێ. دەبمە دەستی کە دەستی هەبێ. دەبمە پێی کە پێی بڕوات. ئەگەر هەر شتێ داوا بکات پێی دەدەم. داوای پاراستن بکات لەهەر شتێ دەیپارێزم. (ب)
- **٨١٦- سەرکردەی هەق خواز. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی لەژێر سایەی خودایە کە لەو ڕۆژ جگە لەسایەی خودا هیچ سایەکی تر نییە. هەروەها لەسەر مینبەری نورە، ئەم فەرموودە هەموو گەورەیەك دەگرێتەوە وەك باوك، سەرکردە.
- **٨١٧- پەیمان نەشکاندن. دەگێڕنەوە:** لەجابر فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر سامانی بەحرەین بۆ مان هات ئەوەو ئەوەت دەدەمێ. دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) مەرگی خودای بە جێ هێنا ئەبوبەکر لەجێی دانیشت، گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی قەردی لەسەر کێ هەیە؟ جابر گوتی: من. دەڵێ چونکە سامانی بەحرەین هات ئەبو بەکر ٥٠٠ درهەمی بۆ ژمارد.لەپاشاندا گوتی: ئەوەندەی تریش ببە. (ب.م)
- **٨١٨- ئامۆژگاری ناوە ناوە دەبێت. دەگێڕنەوە:** ئیبن مەسعود هەموو پێنج شەممەیەك ئامۆژگاری یارانی دەکرد. گوتیان پێمان خۆشە هەموو ڕۆژێ بێ ی گوتی: من وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەکەم. چونکە ئێوە سستو بێزار دەبن. (ب.م)
- **٨١٩- ترسی نەنساران لەفەتوادان. دەگێڕنەوە:** لەئیبن لیلی دەڵێ: جارێ ١٢٠ یاوەری ئەنساریم دی، پرسیارێکیان ئاراستە کردن، ئەو دەیوت برۆ لای ئەوە، ئەوی تر دەیوت برۆ

لای ئەوە، تا کابرا هاتەوە لای پیاوی یەکەم، کەچی هەموویان شارەزابوون، بەڵام لـەخودا دەترسان.

- **٨٢٠- ئامۆژگاری ئـیبن مەسـعود. دەگێڕنـەوە:** ئـیبن مەسـعود فەرموویـەتی: کەسـێ هـەر پرسیارێکی لێ بکەن فەتوا بدا، ئەوا شێتە.
- **٨٢١- ئامۆژگاری قاسمی محمد. دەگێڕنەوە:** جارێك پیاوێ هاتە لای بۆ پرسیارێ، ئـەویش وەرامی نەدایـەوە، کـابرا وازی لـێ نـەدەهێنا قاسـم گـوتی: تـۆ تەماشـای ریـشی درێـژو دەوروبەرم مەکە ئاوەدانە، سوێند بە خودا نازانم.
- **٨٢٢- ئامۆژگاری مالك. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: ئەو پیاوەی فەتوا دەدا لەسەرەتادا، دەبێ خۆی ئامادەبکات، بۆ بەهەشت، یا دۆزەخ.
- **٨٢٣- زانست قورسە. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ پرسیاری لەپێـشەوا مالـك کـرد. ئـەویش گوتی: نازانم، کابرا گوتی: ئەو پرسـیارە ئاسـانە. پێـشەوا مالـك گـوتی: ئـەی قورئـان نـا فەرموێ: (انا سنلقي عليك قولا ثقيلا). واتا: زانست هـەمووی زەحمەتـە، قورسـە، گرانـە، سانا نیە.
- **٨٢٤- ئامۆژگاری زانای عێراق. دەگێڕنەوە: جارێ** پرسیاریان الشعبی کرد. گـوتی: نـازانم. گوتیان تـۆ زانـای عێراقـی، چـۆن شـەرم ناکـەی دەڵێـی نـازانم، گـوتی: ئـەی فریـشتەش نەیانگوت: لا علـم لـنا. واتا: ئێمە نازانین.
- **٨٢٥- وەرام نەدانەوەی پرسیار. دەگێڕنەوە:** پیغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك پرسیاری لێ بکرێ، ئەویش وەرامەکەی بشارێتەوە، خودا بە لغاوی ئاگر، لغاوی دەکات.
- **٨٢٦- خۆت چاك بکە. دەگێڕنەوە:** ئیبن مەسعود فەرموویەتی: خراپترین کەس ئەو کەسەیە، کە بڵێی لەخودا بترسە، بڵێ جارێ تۆ خۆت چاك بکە.
- **٨٢٧- پێشەوا عومەرو پیاوێ. دەگێڕنـەوە:** جـارێ پـیاوێ بـە پێـشەوا عومـەری گـوت: لەخودا بترسەایەکێ گوتی: تۆ چۆن قـسە بـە مـیری موسـڵمانان دەڵێـی. پێـشەوا عومـەر گوتی: لێی گەرێن، ئەگەر پیاوی ئاوا هەبێ، پیاوی وەك منـیش پێـی نـاخۆش نـەبێ، ئـەوە نیشانەی چاکەیە.

- **٨٢٨- قارونی تاوانبار. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: قارونی تاوانبار کاتێ لەماڵ چووە دەر زۆر لەخۆبایی بوو، خۆی خاوێنو باوێن کردبوو، کە چی خودا ڕقی لێ گرتو لەزەوی بردە خوار. تا ڕۆژی دوایی لەزەوی دەچێتە خوار لەبنەڕەت ئەو قارونە هەژار بوو. خودا ناس بوو، بە موسی پێغەمبەری گوت: نزام بۆ بکە دەوڵەمەند بم. کەچی کە دەوڵەمەندبوو گوتی: ئەو ماڵەم بە زانستی خۆم پەیدا کردووە!(ب.م)
- **٨٢٩- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی مرۆڤ: هەموو ڕۆژی دوو سێ جار قنگی بە پیسایی، بەئاو دەشوات. ئینجا نازو فیز لەسەر خەڵك دەکات.
- **٨٣٠- خۆشەویستی دۆستان. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: لەدەورووبەری تەختی خودا کورسی دانراوە، تاقمە کەسێك لەسەری دانیشتوون روویان وەك مانگی چواردەیە، لەکاتێ خەڵك دەترسێن، ئەوان ترسو خەمیان نییە، خودا بەبێ پرسیار دەیانباتە بەهەشت، یاران گوتیان ئەوانەکێن گوتی: ئەو کەسانەن کە یەکتریان لەبەر خودا خۆش دەوێ. (ئەبو هریرە)
- **٨٣١- چاکترین چاك. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دەزانن چاکترین چاك کێ یە؟ گوتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی خودایە. چاکیش منم، لەنێو نەوەکانی ئادەم. هەروەها کەسێکە فێرە زانست بێو بلاوی بکاتەوە. یا لەڕێی خودا شەهید بێ.
- **٨٣٢- سوودەکانی نەخۆشی. دەگێڕنەوە:** سەلمانی فارسی نەخۆش کەوت. پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای گوتی: تا نەخۆش بی خودات لەبیرەو تاوانت ڕەش دەبنەوەو نزات گیرایە.
- **٨٣٣- تاوانبار. دەگێڕنەوە:** نوح پێغەمبەر(ﷺ) ٩٥٠ ساڵ شەوو ڕۆژ ئامۆژگاری گەلەکەی کرد. کۆمەڵێکی کەم باوەڕیان پێ کرد. جا لەخودا پاڕایەوە، کە بە لافاو لەناویان ببا، ئەوەبوو کوڕەکەی باوەڕی پێی نەبوو، ئەویش لەبەر سۆزی باوکایەتی گوتی: کوڕم وەرە سواری کەشتی بە. خودا فەرمووی: چۆن بەوە دەڵێی کور ئەوە پیاوێکی خراپە، ئینجا کوڕەی نەفام دەیگوت من دەچمە سەر چیا، تا خۆی بە فەتارەت دا.
- **٨٣٤- چاکی وەیسی قەرەنی. دەگێڕنەوە:** کاتێ نەخۆش دەکەوت، پێدەکەنی دەیگوت: خودایە ئەو پلە بەرزەت چۆن بە من داوە!

- ٨٣٥- **زانستو تەمەنی لوقمان. دەگێڕنەوە:** لوقمانی حەکیم ١٢ هەزار زانستی زانیوە. تەمەنی هەزار ساڵ بوە، شوانی داود پێغەمبەر بووە، لەپێش ئەوەی داود ببێتە پێغەمبەر فەتوای دەدا. بەڵام دوایی وازی لێ هێنا، کوڕە پووری ئەیوب پێغەمبەر بوو. حەبەشی بووە. لێوی گەورە بووە. لەقورئاندا سوورەتێ بە ناوی ئەو هەیە.
- ٨٣٦- **نەخۆشی موسڵمانو کافر. دەگێڕنەوە:** لەسلمانی فارسی جارێ چووە لای نەخۆشێ گوتی: نەخۆشی موسڵمان گوناهەکانی ڕەش دەبنەوە بە هۆی نەخۆشی، بەڵام کافر وەك وشتری چەموشە کە کاتێ خاوەنەکەی دەیبەستەوەو بەرەڵڵای دەکات دەچێتەوە سەر چەموشی جاران.
- ٨٣٧- **ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: موسڵمان لە دونیا لەخودا دەترسی، لەدوارۆژ ئاسایشە، مونافیق لەدونیا لەخودا ناترسی، لەقیامەت نائاسایشە.
- ٨٣٨- **درۆزن لەدۆزەخە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: نەکەن درۆ بکەن. چونکە درۆ بۆ خراپەتان دەبات، خراپەش بۆ دۆزەخ، ئەگەر بەردەوام بن، لەلای خودا بە درۆزن لەقەلەم دەدرێن.
- ٨٣٩- **درۆکردن لەگەڵ مندال. دەگێڕنەوە:** لەو کاتەی عوبەیدوڵڵای عامر مندالْ دەبێ، دایکی بانگی دەکات وەرە پێت بدەم. پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ چی پێدەدەی دەڵێ قەسپ. پێغەمبەر دەڵێ دەزانی ئەگەر پێت نەدا بوایە، لەلای خودا بە درۆزن لەقەلەم دەدرای. (د. البیهقی)
- ٨٤٠- **چاکترین بەخشین. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هیچ بەخششێ چاکتر نییە لەئامۆژگاری باوك بۆ مندالْ.(ت)
- ٨٤١- **مافی باوك لەسەر مندالْ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: مافی باوك لەسەر مندالْ ئەوەیە ناوێکی جوانی لێ بنێ‌و فێرە ئادابی چاکی بکات.(البیهقی)
- ٨٤٢- **دەروونی ئارام. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەی خودایە دەروونم ئارام بکە، باوەڕم بە دیتنت بێ، ڕەزامەند بم بە کارت، قەناعەتم هەبێت بە ڕۆزیت.
- ٨٤٣- **چوار وشەی جوان. دەگێڕنەوە:** پیاوێك لەهەموو خوێند خانەکانی ئەندەلوس، ئەم

چوار وشەی دەنوسی زانستی زانا، دادی پادشا، نزای پیاو چاك، گەوریتی ئازار.

- **٨٤٤- چاکی داودی تائی. دەگێڕنەوە:** لەپاش مەغریبێ رەبیع چووە لای، دیتی کەمێ نانی رەقی لەپێشە لەگەڵ ئاوی گەرم. رەبیع گوتی: بۆ کوندەیەك دانانێیت، گوتی: ئەگەر نانی رەق نەخۆیت‌و ئاوت گەرم نەبێ‌و جلت درِنەبێ، ئەی چیت بۆ قیامەت داناوە.
- **٨٤٥- سێ کاری چاك. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێ خوداو پێغەمبەری(ﷺ) لەهەموو کەسێ خۆشتر بووێ، هەموو کەسێکی لەبەر خودا خۆش بووێ، پێی ناخۆش بێ لەدین هەڵگەڕێتەوە، هەروەك پێی ناخۆشە بکەوێتە نێو ئاگر، ئەوە تامی باوەڕی کردووە.
- **٨٤٦- دوو جەژن لەئیسلامدا هەیە. دەگێڕنەوە:** کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چووە مەدینە خەڵکەکە یاری‌و وازییان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بە بۆنەی چی یە؟ گوتیان: جەژنە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خودا دوو جەژنی چاکتری پێداون جەژنی رەمەزانی پیرۆزو قوربان.
- **٨٤٧- گرنگێتی شیو کردن. دەگێڕنەوە:** لەپێشەوا عەلی گوتی: ئەگەر کۆمەڵە برادەرێکم داوەت بکەم، لام چاکترە لە ئازاد کردنی بەندەیەك.
- **٨٤٨- پێشەوا عەلی لەجەژنانە. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ لەجەژنی رەمەزان چووە لای پێشەوا عەلی، سەیری کرد وا نانی وشك دەخوات، گوتی: باشە بەو جەژنە شتێ نییە بیخۆیت؟ پێشەوا گوتی: ئەو رۆژە جەژنە کەپیاو تاوانی تیادا نەکات.
- **٨٤٩- منداڵی عومەری عەبدولعەزیز لەجەژنانە. دەگێڕنەوە:** جارێ کوڕێکی عومەری عەبدولعەزیز لەڕۆژی جەژن کراسێکی خراپی لەبەر دابوو، لەبەر سۆزی باوکاتی گریا، کوڕەکە گوتی: باوکە لەو کاتە بگریێ کە خودا لێمان نارازی بێ‌و لەگەڵ تۆو دایکم خراپ بم.
- **٨٥٠- کۆڕی بێ زکر. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەر کۆمەڵێ لەکۆڕێ، یادی خودا نەکەن تا هەڵسان، ئەوە ئەو کۆڕە لەلای خودا بێ نرخترە لەکەلاکێ، کە لەدوارۆژ ئاخی لەسەر هەڵدەکێشن.(د)

• ٨٥١- **ئاخی بەهەشتیان. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بەهەشتیەکان ئاخ لەسەر ئەو کاتانە هەڵدەکێشن،کە یادی خودایان تیادا نەکردووە.(ابن انس)

• ٨٥٢- **هەموو کەسێ تێنووە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو کەسێك تێنوە لەوکاتەی لەدونیا دەردەچێ.جگە لەو کەسەی کە یادی خودای کردووە.

• ٨٥٣- **ئامۆژگاری ئەنەس لەبارەی زکر. دەگێڕنەوە:** انس فەرموویەتی زکری خودا نیشانەی باوەڕە. ڕزگاربوونە لەنیفاق. شورەیە لە دژی شەیتان.پارێزگارییە لەدۆزەخ.

• ٨٥٤- **ئامۆژگاری مالیکی دینار. دەگێڕنەوە: فەرموویەتی:** کەسێك بە یادی خودا هۆگر نەبیێ، زانستی کەمە، دڵی کوێرە، تەمەنی بە فیرۆچوە.

• ٨٥٥- **ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: تامو چێژ لەم سێ شتەیە: قورئان خوێندن، نوێژ، یادی خودا.

• ٨٥٦- **زمانت بە زکر تەڕبکە. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: من پیر بووم‌و، فەرمانەکانی ئیسلام زۆربوونە، چاکترین شتم پێ بڵێ، پێغەمبەر فەرموویەتی: هەمیشە زارت بە یادی خودا تەڕبێ.

• ٨٥٧- **ئەو زەویەی زێڕی لەژێرە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێ لەپێش ئێوە زەویەکی فرۆشت، کابرای کڕیار جەرە زێڕێکی لەژێر دۆزیەوە. بە کابرای فرۆشیاری گوت: من زێڕم لەتۆ نەکڕیوە، با بۆ خۆت بێ، ئەوی تر دەیوت من زەویەکەم بە زێڕەوە فرۆشتوە، لەسەر ئەو کێشەیە چوونە لای حاکم. حاکم گوتی: ئێوە منداڵتان هەیە، یەکێك گوتی: کوڕێکم هەیە، ئەوی تر گوتی: کچێکم هەیە، حاکم کچەکەی دا کوڕەکە. (ب.م)

• ٨٥٨- **یارمەتی سێ کەس لەسەر خودایە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: یارمەتی ئەم سێ دەستەیە هەقە لەسەر خودا: یەکەم بەندەی نامە پێدراو، خەباتگێڕی ئیسلام، وئەو کەسەی ژنی هێناوە.(أ.ن.ت)

• ٨٥٩- **سوودی ژن هێنان. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەی دەستەی لاوان ژن بهێنن چونکە بۆ چاو باشەو، بۆ دامەن شورەیە، کەسێ: کە توانای نەبوو، بابەڕۆژووبێ چونکە ڕۆژوو ئارەزوو کەم دەکاتەوە.

- ٨٦٠- **سێ حەسوود. دەگێڕنەوە:** جارێ سێ حەسوود بەیەك گەیشتن یەكێ: گوتی: من لەبەر حەسوودیم پێم خۆش نییە، چاكە لەگەڵ كەس بكەم، گوتیان: تۆ چاكی، دووهەم گوتی: پێم خۆش نییە كەس چاكەم لەگەڵ بكات، سێهەم بە دووهەمی گوت: تۆ چاكی، سێهەم گوتی: پێم خۆشە هەموو كەسێك یەك نیعمەتی نەمێنێ!یەكەمو دووهەم گوتیان: تۆ لەهەر دووكمان خراپتری.
- ٨٦١- **كوڕی داكە ڕەشێ.** دەگێڕنەوەك جارێ ئەبو ذر بە بلالی گوت: كوڕی داكە ڕەشێ، پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لێ بوو زۆر دڵ تەنگ بوو، ڕووی سوور هەڵگەڕا، جا ئەبو ذر گوتی: بلال پێت لەسەر سەرم دابنێ.
- ٨٦٢- **عومەری عەبدولعەزیزو أبا قلابە. دەگێڕنەوە:** جارێ عومەری عەبدولعەزیز بە أبا قلابەی گوت: ئامۆژگاریم بكە، گوتی: لەسەردەمی ئادەم، تا ئێستا هیچ گەورەیەكی ئیسلام نەماوە جگە لەخۆت. عومەر گوتی: زیاتر. گوتی: ئەگەر خودا لەگەڵت بێ لەكێ دەترسی، ئەگەر لەگەڵت نەبی، پەنا بۆ كێ دەبەیت! عومەر گوتی: بەسە.
- ٨٦٣- **ئازایەتی ئەنەسی** نضر. **دەگێڕنەوە:** لەجەنگی ئوحود دەیگوت: ئەی معاذ بە خودای كەعبە، من بێنی بەهەشت دەكەم، خۆی ئامادەكرد بۆ جەنگ -٨٠- و هەندێك شمشێرو تیریان لێدا، جەستەیان هەموو پارچە پارچە كرد، كەسێك نەبوو تەرمەكەی بناسێتەوە، جگە لەخوشكێكی ئەویش بەهۆی سەری پەنجەكانی ناسیەوە! (ب.م)
- ٨٦٤- **ئازایەتی حنظلە. دەگێڕنەوە:** لەشەوو ڕۆژی زاوایەتی بانگی جیهاد درا. لەبەرەبەیانی ڕۆژی هەینی حنظلە، ڕووی لەغەزا كردو زرێی بەستو شمشێری هەڵگرتو بۆ غەزا چوو. جەنگی ئوحود بوو. وای لەو جەنگە گەورەیە حنظلە ڕووی لەئەبو سفیان كرد بیكوژێ، بەڵام ئەبو سفیان بانگی كافرەكانی كردو دەوریان لێ داو شەهیدیان كرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فریشتەی خودا شۆردیان یاران تەماشای سەریان كرد تەڕ بوو. پرسیاریان لەخێزانەكەی كرد گوتی: كە لەماڵ چوە دەر غوسلی لەسەر بوو..
- ٨٦٥- **ئامۆژگاری عومەری خەتاب. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: كاتێ پیاوێ دەبینم بەرگی جوانی پۆشیوە، بێنی خۆشی لەخۆی داوە، پرسیار دەكەم ئەو پیاوە چ كار دەكات؟ كاتێك

دەڵێن هیچ، لەبەر چاوم دەکەوێت!.

- **٨٦٦- شۆردنی سێ شت. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان دڵ بە خودا پەرستی بشۆ، دەروون بەگریان ، گیان بە یادی پەروەردگار.
- **٨٦٧- پێنج کاری چاك. دەگێڕنەوە:** سەعیدی زەید فەرموویەتی: موسڵمان پێویستە ئەم پێنج کارە ئەنجام بدات.: خودا ناسین، هەق ناسین، کار بۆ خودا، کار کردن لەسوننەت، خواردنی ڕەوا.
- **٨٦٨- باوەڕ بە ئازاری گۆڕ. دەگێڕنەوە:** زانایان دەڵێن: ئەگەر پیاوێك لەنێوانی دوو پیاوی خەوتو دابنیشێ یەکێ: خەونی خۆش ببینی، ئەوی تر خەونی ناخۆش، ئەو پیاوەی لەنێوانیان دانیشتوە ئاگای لەهیچ نییە. ئازاری گۆڕیش ئاوەهایە.
- **٨٦٩- أبا زرعەو وەلیدی عبدالمليك. دەگێڕنەوە:** جارێ (أبا زرعە) چوە لای ئەو پاشایە. پاشا گوتی: تۆ قورئان خوێنی ئامۆژگاریم بکە. گوتی: ترسم لەخۆم نەبێ. وەلید گوتی: نەء أبا زرعە. گوتی: داود پێغەمبەر، پێغەمبەری خودا بوو، پادشاش بوو، ئینجا خودا پێی گوت: تۆ پادشای بە دوای نا هەق مەکەوە دوایی گومڕا دەبی. ئەنجامت دۆزەخ دەبێ.
- **٨٧٠- بێ فیزی. دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو: بۆچی تامی باوەڕو پێوە نابینم، گوتیان تامی باوەڕ چی یە؟ فەرمووی: شەرم.
- **٨٧١- پاداشتی منداڵ مردن. دەگێڕنەوە:** کاتێ بەندە منداڵێکی دەمرێ. خودا بە فریشتەکان دەفەرمووێ: بەندەی من لەداخی منداڵەکەی چی دەگوت؟ دەڵێن: خودایە سوپاسی تۆی دەکرد، فەرمووێ: بڕۆن خانوێك بۆ بەندەی من دروست بکەن لەبەهەشت، ناوی لێ بنێن خانووی (سوپاس).
- **٨٧٢- نزایەکی موسا پیغەمبەر(ﷺ). دەگێڕنەوە:** موسا پێغەمبەر ماوەی چل ساڵی برد، ئینجا خودا نزای گیرا کرد، کە زاڵ بوو، بە سەر فیرعەونو دارو دەستەی، واتا نزاکەی چل ساڵی برد ئینجا گیرا بوو.
- **٨٧٣- نزایەکی نوح پێغەمبەر. دەگێڕنەوە:** نوح پێغەمبەر ماوەی ٩٥٠ ساڵ لەشەوو ڕۆژدا بانگەوازی کرد ، ئینجا هەر وەڵامیان نەدایەوە، خودا بە لافاو لەناوی بردن، واتا

نزاکەی ٩٥٠ ساڵی برد، ئینجا گیرا بوو.

- **٨٧٤- تەوبە کردن. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: موسڵمان کاتێ تاوان دەکات وا دەزانی کێوی لەسەر سەرە بەڵام مونافیق وادەزانێ مێشولەیەك بە لای تێپەڕیوە.(ب)
- **٨٧٥- رەچەڵەك داد نادات. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خودا بەهەشتی دروست کرد بۆ یەکێ: کە بیناسی جا با بەندەیەکی حەبەشی بێ، دۆزەخی دروست کرد بۆ یەکێك نەیناسێ، جا با قورەیشی بێ. (الإمام زين العابدين).
- **٨٧٦- پارە فرتێنەیە. دەگێڕنەوە:** جارێ حەسەنی بەصری منداڵێکی دیت لەنەوەی پێشەوا عەلی لەژێر دیواری کەعبە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد. گوتی: مولکی ئایین چییە؟ منداڵەکە گوتی: وەرع. گوتی: فرتێنەی ئایین چییە؟ منداڵەکە گوتی: پارەیە.
- **٨٧٧- هەموو کەسێك چوار چاوی هەیە. دەگێڕنەوە:** خالدی معدان فەرموویەتی: هەموو کەسێك چوار چاوی هەیە، بە دووچاوی دونیا دەبینێ، بە دووچاوەکەی تر قیامەت دەبینێ.
- **٨٧٨- منداڵی چاك. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر هەموو بەیانیەك باوان لەمنداڵی ڕازی بێ، ئەوا دوو دەرگەی بەهەشت لەو منداڵە دەبنەوە، هەروەها ئێوارانیش دوودەرگە، ئەگەر نارازی بن ئەوا دوو دەرگەی دۆزەخ لەبەیانیان، دوو دەرگەش لەئێواران. ئەگەر یەکێکیان نارازی بێ، ئەوە دەرگەیەك. (زيد الأرقم).
- **٨٧٩- پێناسەی زوهد. دەگێڕنەوە:** پیاوێ هاتە لای (حاتم لاصم) گوتی: سەرەتای زوهد چیە؟ گوتی: متمانە بە خودا. گوتی: ناوەندی چیە؟ گوتی: ئارامی. گوتی: دواییەکەی چیە؟ گوتی: کارکردن بۆ خودا بە دڵسۆزی.
- **٨٨٠- دڵ لەدووشت گە نجە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: پیاو لەدووشت دڵی گەنجە: خۆشەویستی دنیاو هیوا درێژی
- **٨٨١- پاڵەوانی خودا** . دەگێڕنەوە: جارێ پێغەمبەر بەلای هەندێ هاوەڵ تێپەڕی بەردێکی گەورەیان بەرز دەکرد، فەرمووی ئەوە چییە؟ گوتیان: ئێمە لەسەردەمی نەفامی بەو بەردەمان دەگوت بەردی پاڵەوانان فەرمووی من پاڵەوانتان پێ دەڵێم پاڵەوان ئەو کەسەیە لەکاتی رقو قین دەروونی خۆی لەدەست بێ.

- **٨٨٢- کەی دەبیە زانا؟ دەگێرنەوە:** لەپیاو چاکان پیاو بە سێ شت دەبێتە زانا: یەکەم: بە کەم سەیری پیاوی لەخۆی کەم زانستر نەکات، دووهەم: حەسوودی بە پیاوی لەخۆی زانا تر نەبات، تا بە هیچی دابنێ، سێهەم: زانستەکەی بۆ پارەو پوول نەبێ.
- **٨٨٣- شێوەی غەیبەت کەر. دەگێرنەوە:** لەپیاو چاکان شێوەی ئەو کەسەی غەیبەت دەکات، وەك پیاوێکە ئاگرێکی گەورەی کردبێتەوە، لەهەموو لایەك چاکەی تێ هەڵداتە ناو. هەروەها ئەگەر ناوی کەسێکیان لای تۆ هێنا، ئەوا تۆ دووهەم غەیبەت کەری!!
- **٨٨٤- پێنج کاری گرنگ. دەگێرنەوە:** لەپێشەوا عەلی: پێنج کار تا بە تەواوی ئەنجامی نەدەی ناچێتە ئاسمان: رێزی موسڵمان، شوکری نیعمەت، مافی باوان، رێزی زانا، خودا پەرستی.
- **٨٨٥- گەمەی تاوڵە. دەگێرنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: شێوەی ئەو کەسەی کە تاوڵە دەکات وەك پیاوێکە بچێ دەست نوێژ بە کێمو زوخاو بشوا، ئینجا نوێژ بکات. (أ).
- **٨٨٦- چوار پرسیاری قیامەت. دەگێرنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هیچ کەسێ لەپردی سیرات نا پەڕێتەوە تا چوار پرسیاری لێدەکەن: تەمەنت لەچ خەرج کرد. گەنجیت لەچی خەرج کرد. سامانت لەچی دەستت کەوتو چۆن خەرجت کرد، بەزانستەکەت چ کارت کرد. (ت. البیهقی).
- **٨٨٧- چوار شت کەمیان زۆرە. دەگێرنەوە:** لەجعفری محمد، چوار شت کەمیانو زۆریان وەك یەکە: ئاگر، ناکۆکی، هەژاری، نەخۆشی.
- **٨٨٨- پاداشتی ذکري لا اله الا الله . دەگێرنەوە:**پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێك لا الە الا اللّٰ ی گوتبێ لەئاگری دۆزەخ دەردەچێ، ئەگەر بە ئەندازەی یەك دەنکە گەنم، یا زەرەیەك باوەڕی هەبووبێ. (ب).
- **٨٨٩- زاناو پاشا. دەگێرنەوە:** لە ئەبو ئەسوەدی دۆلی فەرموویەتی: شتێ لەزانست گەورە ترنییە، پادشا گەورەی کۆمەڵە، بەڵام زانا گەورەی پادشاشە.
- **٨٩٠- ئامۆژگاری لوقمانی حەکیم. دەگێرنەوە:** دەیگوت: رۆڵە تاوانەکانت لەنێوانی چاوانت دابنێ، تا مەرگی خودا بە جێ دێنی،چاکەکانیش لەلای یەکێکە هەموویان لەبیر ناکات.

• **٨٩١- ئازایەتی سێ هاوەڵ. دەگێڕنەوە:** لەجەنگی یەرموك فارسی هشامو، عەکرەمەی ئەبو جەهلو، سهیل عەمر بریندار بوون، ئاو گێڕیان ئاوی گێڕا، ئەوانیش لەبەر سۆزی خۆشەویستی هەریەکە دەیگوت: با فیسار ئاوەکە بخواتەوە، تا هەرسێکیان شەهید بوون، کەسیان ئاوەکەیان نەخواردەوە!

• **٨٩٢- هارونە ڕەشیدی عێراق و مالیك. دەگێڕنەوە:** کاتێ هارروونە رەشید چووە حەج، بە یەکێکی گوت برۆ بانگی بکە، پێم خۆشە مالك بێتە لام گوێ لەقسەکانی بگرم، مالك گوتی: من دەچمە لای بەڵام فەرموودەکان ناچنە لای، هارون چووە لای، گوتی: با کەس لەگەڵمان دانەنیشێ مالك گوتی: ئایین تەنها بۆ من و تۆ نەهاتووە گشتی یە.

• **٨٩٣- خەمی نزامە نەگ گیرا بوون. دەگێڕنەوە:** لەپێشەوا عومەر دەیگوت: من خەمی گیرا بوونی نزام نیە، خەمی نزاکردنم هەیە، واتا: گرنگ ئەوەیە نزا بکەی.

• **٨٩٤- گەنجێکی عێراقی. دەگێڕنەوە:** جارێکیان وەفدێك لەعێراقەوە چوە لای عومەر عەبدولعەزیز، عومەر گوتی: کامەتان بە تەمەنترن با ئەو قسەبکات. گەنجەکە گوتی: پاشا ئەگەر حوکم بە تەمەن، بێ لەتۆ بە تەمەنتر هەیە بۆ پاشایەتی!. عومەر گوتی: ڕاست دەکەی.

• **٨٩٥- ئامۆژگاری حەسەنی بەصری. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: سزادانی زانایان لەلای خودا دڵ مردنە، جا کە دڵی مرد، هۆی ئەوەیە: بە کاری قیامەت دونیای کڕیوە!!

• **٨٩٦- ئامۆژگاری عومەرخەتاب دەگێڕنەوە:** نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: ئەگەر بتوانی هەموو چاکەیەکت لەرەزامەندییە ، ئەگینا ئارامبە!!

• **٨٩٧- خەرجکردنی پارە لەخراپە. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان ئەگەر یەك درهەم لەخراپە خەرج بکەی، ئەوە زیادە رەویت کردوە، بەڵام ئەگەر پڕ بە زەوی لەچاکە خەرج بکەی، ئەوە زیادە ڕەوی نییە.

• **٨٩٨- دەوری دڵ لەجەستە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: پارچە گۆشتێ لەجەستە هەیە، ئەگەر چاك بوو، جەستە هەمووی چاك دەبێ، ئەگەر خراپ بوو، جەستە

هەمووی خراپ دەبیٚ، ئەویش دڵە.

- **٨٩٩- نوێژ بەبیٚ فاتحە نابیٚ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: بڕۆ لەنێو خەڵك بانگ بکە، خودا نوێژ بەبیٚ فاتحە قبول ناکا.
- **٩٠٠- سزاو بەخشندەیی خودا.** دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر باوەڕدار بزانیٚ سزای خودا چەندە؟ هەرگیز چاوی لەبەهەشت نەدەبوو. ئەگەر بیٚ باوەڕ بزانیٚ بەخشندەیی خودا چەندە، هەرگیز لەبەهەشت نائومێد نەدەبوو!!
- **٩٠١- شێوەی باوەڕدار. دەگێڕنەوە:** وەك نەخۆش و پزیشك ئاوایە. کە پزیشك دەڵیٚ ئەو خواردنە باشە ئەوە خراپە، ئەوە جاریٚ مەخۆ، خوداش نامەی خۆی بۆ باوەڕدار ڕەوانە کردووە، ئەوە ڕەوایە، ئەوە ناڕەوایە.
- **٩٠٢- تۆ کارت بە خودا نییە. دەگێڕنەوە:** جارێکیان پیاوێك لەتەنیشت عبداللەی مبارەك نوێژی کۆمەڵی دەکرد، کە لە نوێژ سلاٌوی دایەوە، پیاوەکە ڕۆیشت(عبدالله)ش بە توندی کراسی گرت و گوتی: باشە تۆ کارت بە خودا نییە، بۆچی لەپاش نوێژەکەت نزاو پاڕانەوە ناکەیت.
- **٩٠٣- ئامۆژگاری جنید. دەگێڕنەوە:** فەرموویەتی: دڵسۆزی شتێکی شاراوەیە لەنێوان خوداو بەندە..! نە فریشتە دەزانیٚ کە پاداشتەکەی بنووسیٚ، نە شەیتان دەتوانیٚ خراپی بکات، نە هەواو ئارەزووی خاوەنەکەی دەتوانیٚ بیگۆڕیٚ.
- **٩٠٤- خودا ڕقی لەچوار کەسە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خودا ڕقی لەفرۆشیاری سوێند خۆر، هەژاری لووت بەرز،پیرەمێردی داوێن پیس، پاشای ناهەقە.(ن ).
- **٩٠٥- بێنی بەهەشت ناکات. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کەسێك فێرە زانستیٚ بوو لەبەر خودا، لەپاشاندا بە هۆی ئەو زانستە کەوتە دوو دونیا، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات.(د)
- **٩٠٦- ئەوەندەت بەسە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) بە عبدالله ی خبیی گوت: هەموو بەیانیەك و ئێوارەیەك سورەتی(الإخلاص، المعوذتین) سیٚ جار بخوێنە ئەوەندەت بەسە.
- **٩٠٧- بانگی برات مەکە بە کافر. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر

موسڵمانیێ بلێ: هەی کافر، یا فاسق ئەوە ئەگەر کابرا کافرو فاسق نەبێ بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. (ب).

- **٩٠٨- سێ ڕەوشتی ئەولیا. دەگێڕنەوە:** لەیەحیای معاذ، یەکەم متمانەی هەر بە خوایە، دووهەم خۆی لەبەر خودا پێ دەوڵەمەندە، سێهەم لەهەموو شتێ دەگەڕێتەوە لای ئەو.
- **٩٠٩- سەرۆك قەردی موسڵمانان دەداتەوە! دەگێڕنەوە:** لەسەردەمی عومەری عەبدولعەزیز، کاربەدەستێکی هەبوو لەباکووری ئەفریقیا نامەی بۆ ڕەوانە کرد. قوربان سەروەت‌و سامانی موسڵمانان زۆر بووە چی لێبکەم؟ عومەر گوتی: قەردی قەرداران بدەوە، گوتی: قەردارەکان خانوو ولاخ‌و نوێنیان هەیە؟ عومەر گوتی: ئەوە شتێکە پێویستە هەموو کەس هەیبێ.
- **٩١٠- زیانەکانی دامەن پیسی. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دامەن پیسی شەش زیانی هەیە، سیانیان لەدونیا: نەمانی نرخی دامەن پیس‌و، تووش بوونی هەژاری‌و، تەمەن کورتی، سیانیش لەدوارۆژ، ڕق‌و قینی خوداو، لێپرسینەوەی خراپ‌و، ئازاری دۆزەخ. (السیوطي).
- **٩١١- دامەن پیسی باوەڕ لادەبا. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دامەن پیس کاتێ دامەن پیسی دەکات باوەڕی نیە. ٢- دزیکەر کاتێ دزی دەکا باوەڕی نیە. ٣- ئارەق خۆر کاتێ ئارەق دەخواتەوە باوەڕی نیە. (ب.م).
- **٩١٢- گەورەترین دامەن پیسی. دەگێڕنەوە:** پرسیاریان لەپێغەمبەر(ﷺ) کرد، گەورەترین تاوان چی یە؟ فەرمووی: هاوبەشی دانانە بۆ خودای تاك‌و تەنها، گوتیان لەپاشاندا فەرمووی: دامەن پیسی کردن لەگەڵ ژنی هاوسێ.
- **٩١٣- بڵاوبوونەوەی دامەن پیسی. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: گەلی من هەر لەنێو چاکە دان تاك‌و دامەن پیسیان لەنێو بڵاودەبێتەوە، کە بڵاوبۆوە خودا هەموویان ئازار دەدا، باش‌و خراپ.
- **٩١٤- سێ ڕەوشت لەسێ کات دەزانرێ. دەگێڕنەوە:** لوقمانی حەکیم گوتی: ڕۆڵە پیاوی نەرم لەکاتی تووڕەیی دەناسرێ پیاوی ئازا لەکاتی جەنگ دەناسرێ، برادەریش لەکاتی پێویستی.

- **٩١٥- ئامۆژگاری پێشەوا عوسمان. دەگێڕنەوە:** کەسێك دونیا بەندیخانەی بێ، گۆڕ بەهەشتیەتی، ئەگەر دونیا بەهەشتی بێ، گۆڕ بەندیخانەیەتی. ئەگەر پشت لەدونیا بکات، خودا لەدوارۆژ پاداشتی دەداتەوە.
- **٩١٦- زەردی شەیتان و قازانجی ئادەم. دەگێڕنەوە:** لەیوسف فەرموویەتی: ئادەم چونکە مل کەچ بوو، تووشی لێبووردن و رێز بوو لەلای خودا، بەلام شەیتان چونکە لەخۆ بایی بوو تووشی زیان بوو.

- **٩١٧-شادی لەکاتی مەرگ. دەگێڕنەوە:** لەعەبدوڵلای حماد دەڵێت: لەسەرە مەرگ چوومە لای بشري منصور، زۆر شادو دڵخۆش بوو، گوتم تۆ وا لەسەرە مەرگی ئەوەندە روو خۆشی؟ گوتی: سبحان الله وا لەنێو زۆردارو دزو پیاو کوژان دەرۆم دەچمەوە لای خودا، چۆن دڵخۆش نەبم!.
- **٩١٨- پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی مەرگی ئیبراهیمی کوڕی. دەگێڕنەوە:** کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ)مەرگی خودای بەجێهێنا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئیبراهیم ئێمە لەبەر تۆ خەمدارین، چاومان ئەشك دەرێژێ، دڵمان خەمدارە، قسەیەك ناڵێین خودا پێی ناخۆش بێت.
- **٩١٩- جوانی پیاو لەزمانەوەیە. دەگێڕنەوە:** جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە عەبباسی مامی فەرموو: جوانی تۆ دڵی خۆشکردوومە، مامی گوتی: جوانی پیاو چی یە؟پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: زمانە.
- **٩٢٠- هەموو شتێ ئاشکرا دەبێ. دەگێڕنەوە:** جارێکیان داود پێغەمبەر خەریکی ئاسنگەری بوو، لوقمان خەریك بوو بڵێ ئەوە چی دروست دەکەی؟بەلام دەنگی نەکرد. دوای کەمێك داود زرێیەکی دروست کردو هەر خۆی گوتی: زرێیەکی جوانە! لوقمان گوتی: کڕو کەپی دانایە، بەلام بکەری ئەو شتە کەمن.
- **٩٢١- ئامۆژگاری پێشەوا عومەر بۆ کوڕەکەی. دەگێڕنەوە:** لەسەرە مەرگ بەعبداللە ی کوڕی گوت: ڕەوشتی باوەڕ ئەمانەیە: ڕۆژو گرتن لەگەرما، دوژمن کوشتن بە شمشێر، ئارامی لەکاتی ناخۆشی، دەست نوێژ لەکاتی ساردی، زۆر نوێژکردن لەکاتی هەورو

باران، ئارەق نەخواردنەوە.

- **٩٢٢- وەڵامی عبدالله ی عەباس و مەسروق. دەگێڕنــەوە:** پرسـیاریان لـەعبـدالله ی عـەباس کرد. ئایا پیاوێ نەزری کردبێ کوڕەکەی سەر ببڕێ لەجیاتی سەربڕین گوناه شۆری چـی یە؟ فەرمووی: سـەربڕینی سـەد وشـتر. مەسـروق زانایـەکی شـوێن کـەوتوو بـوو گـوتی: وەڵامەکەی هەڵەیە هەر مەڕێکە. چونکە خۆ لەکوڕی کابرا لەئیسماعیل پێغەمبەر گەورەتر نیە، کە گوناە شۆری بەرانێك بوو!.
- **٩٢٣- خراپەو چاکە. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان ئەگەر خودا بەندەیەکی مـل کـەچ کـرد، ئەوە خودا پەرست دەبێ، قەناعەتی دەبێ، شارەزا دەبێ لەئایین و یەقینی بەهێز دەبێ. ئەگـەر بەندەکەش مل کەچی نەکرد، ئەوە سامانی خۆش دەوێ، هیوای درێژ دەبێ، خەریکی دنیـا دەبێ، تووشی ئارەزوو دەبێ.
- **٩٢٤- وانەی تێرو پڕ. دەگێڕنەوە:** عیسا پێغەمبەر بە هاوەڵەکانی گـوت: کابرایـەك رووت بێ چی لێ دەکەن؟ گوتیان: بـەرگی لەبـەر دەکـەین، گـوتی: نـەخێر کـە باسـی یـەکێك دەکرێ، بۆ زاری باس کەرەکە ناگرن، ئەوە بەرگ لەبەر کردنە.
- **٩٢٥- چۆنیەتی واز هێنان لەدەعیە. دەگێڕنەوە:** سەعدی وەقاص گوتی: رۆڵە: واز بهێنە لەدەعیە، بۆ واز هێنان بیر بکەوە لەئەو خودایەیتۆی هێناوەتە بوون، لەپاش هـاتنی هەجـەل بۆ لای خۆی دەیباتەوە.
- **٩٢٦- خەم نەخواردن. دەگێڕنەوە:** لەپێشـەوا عەلی لە ئەشعەثی قیسی گوتی: ئەگەر ئـارام بگری لەسەر گرفتێ ئەوا پاداشتت بۆ دەنووسرێ، لەگەڵ پێنووسی خـودا چـی نـاگۆترێ. بەڵام ئەگەر ئارامگری ئەوا تاوانت بۆ دەنووسرێ و لەگەڵ پێنووسی خودا چی ناگۆترێ.
- **٩٢٧- شاردنەوەی ناخۆشی. دەگێڕنــەوە:** لەکـەعب گـوتی: لەتەوراتـدا نووسـراوە، هـەر کەسێك گرفتی خۆی لەلای خەڵك باس بکات، ئەوە سکاڵای لەخودا کردووە.
- **٩٢٨- سوودی گرفت. دەگێڕنەوە:** جارێ عەرەبێك بەلای ماڵێکـدا تێـەڕی، ماڵەکـە شـین و گریانیان بوو، گوتی: ئەوە بۆ؟ گوتیان یەکێکیان مردووە، گـوتی: ئەوانـە رقیـان لەقـەزای خودا دەبێتەوەو لەپاداشتی دوور دەکەونەوە.

- **٩٢٩- پێشەوا عومەرو فرۆشیار. دەگێڕنەوە:** هەموو جارێ دەچووە بازێڕ، گۆچانێکی لەدەست دابوو، پرسیاری لەدوکانداره‌کان دەکرد، ڕەوا چۆنە؟ ناڕەوا چۆنە؟ ئەگەر نەیانزانیبوایە لێی دەدان!.
- **٩٣٠- دەردو دەرمان بەدەست خودایە، دەگێڕنەوە:** لەئیبراهیم پێغەمبەر فەرمووی: خودایە دەرمان کێ دایناوە؟ خودا فەرمووی: من ئیبراهیم گوتی: ئەی دەرد؟ خودا فەرمووی: من، ئیبراهیم گوتی: کەواتە بۆ بچینە لای پزیشك خودا فەرمووی : پزیشك ڕەوانە کراوی منە.
- **٩٣١- بازرگانی ڕاستگۆ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (التاجر الصدوق المسلم مع الشهداء يوم القيامة). ابن ماجه. واتا: بازرگانی موسڵمانی ڕاستگۆ لەدوارۆژدا لەگەڵ شەهیدەکانە.
- **٩٣٢- پاداشتی کاسبکار. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەو کەسەی بێوەژن و هەژار بەخێو دەکات، وەك ئەو کەسەیە کە خەبات دەکا لەڕێی خوداو لەشەوو ڕۆژدا بەڕۆژووە. (ابن ماجه).
- **٩٣٣- نەرمی لەتێکەو لێکەدا. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بەخشندەیی خودا لەو پیاوەی لەکاتی کڕین و فرۆشتن و قەرد دانەوە نەرمە. (رحم الله عبدا سمحا اذا باع سمحا اذا اشتری سمحا اذا اقتضی). (ابن ماجه).
- **٩٣٤- فرۆشیاری سوێند خۆر. دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خودا لەڕۆژی دوایی قسە لەگەڵ سێ کەس ناکات و سەیریشیان ناکات، ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە. ئەبو ذەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوانە کێن بە فتارەت چوون؟ فەرمووی: ئەوەی جلی شۆڕ لەبەر بکات و خێر بە منەت بکات و لەکاتی فرۆشتن هەتا لێی بکڕن سوێند بخوات.. (ابن ماجه).
- **٩٣٥- مافەکانی میوان: دەگرێنەوە:** لەپیاو چاکان مافی میوان سێ شتە: خۆراکی ڕەوای لەپێش دابنێ- چاودێری کاتی نوێژەکانی بکەی- داوای هیچ شتێکی لێ نەکەی.
- **٩٣٦- نزای چوونە بازێڕ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کاتێ چوونە بازێڕ ئەم

نزایە بکەن: لا اله الا الله وحده لا شریك له، له الملك وله الحمد وهـو حـي لا یموت بیـده الخـیر وهـو علـی کـل شـيء قـدیر. هـەزار هـەزار خراپـەی ڕەش دەبێتـەوە، خانوویـەکی لـەبەهەشت بۆ دروست دەکەن.

- **٩٣٧- هەندێ لەکارو پیشەی پێغەمبەران. دەگێڕنەوە:** ئادەم پێغەمبەر جووتیاری کردووە. حەوای خێزانی خوری ڕێس بووە، ئیدریس پێغەمبەر جل دوورینو خۆش نووسی کـردووە، نوحو زەکەریا پێغەمبەر دارتاش بوونـە، هـودو صـالح پێغەمبـەر بازرگـان بوونـە، ئیـبراهیم پێغەمبەر جوتیارو دارتاش بووە، ئەیوب جووتیار بوە، داود پێغەمبەر ئاسنگەر بـووە، موسـاو شعیبو محمد شوان بوونە سڵاوی خودایان لـەسەر بێت.
- **٩٣٨- پێشەوا عەلیو قوڕ کێشان. دەگێڕنەوە:** جارێکیان برسیەتی زۆر کـاری لێـدەکات. لـەدەوروبەری مەدینە دەگەڕێ، تا تووشی ژنێ دەبێ، کە خـۆڵێکی زۆری کـۆ کردۆتـەوە. دەیەوێ بە کرێکارێ بیکاتە قوڕ، پێشەوا عەلی لـەگەڵی ڕێککەوت هەر سەتڵێ بـە دەنکـە خورمایەك، تا شازدە سەتڵی بۆ کردە قوڕ، لـەپاشاندا دەستی پفکەی لێهات، چـیدی کـاری پێنەکرا، چووە لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر کەیفی خۆش بوو، بـە ئـەو کـارەی پێشەوا عەلی، هەندێ خورماشی لـەگەڵ خوارد.
- **٩٣٩- جوتیار پشتی بە خودا بەستاوە. دەگێڕنەوە:** جارێکیان پێشەوا عومەر لـەیەمەن، بـە لای کۆمەڵە کەسێك تێپەڕی فەرمووی: ئێوە چین؟ گوتیان ئێمە پشتمان بە خودا بەسـتاوە؟ گوتی: درۆ دەکەن، ئەو کەسە پشتی بە خودا بەستاوە، کە دەنکە گـەنمێك مـاوەی(٥-٦) مانگ لـەژێر زەوی دەشارێتەوە، تاکو بەرهەمێکی بکەوێتە دەست.
- **٩٤٠- پێغەمبەر(ﷺ) ئیشی بۆ پیاوێك دۆزی یەوە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبـەر(ﷺ) بـەپیاوێکی ئەنساری هەژاری گوت: باشە چیت لـەماڵدا هەیە؟ گوتی: تەنها جلێك، هەم بـۆ ڕاخسـتن هەم بۆ لـەبەرکردن لـەگەڵ جامێك، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ بیـان بهێنـە، کـە هێنـای فـەرمووی: ئـەی یـاران ئـەو جلـەو قاپـە بـە چـەند دەکـڕن یـەکێك گـوتی: درهـەمێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ زیادی دەکات؟ یارێك گـوتی: دوو درهـەم، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ درهەمێك خەرج بکە بۆ ماڵو پاشان ئەو درهەمەش بـە تـەور بـدە دارێکـی

ئەستوورو چاکی بەدەستی پیرۆزی لەتەورەکە قایم کرد فەرمووی: هەتا پانزە ڕۆژ نەتبینمەوە، دوای پانزە ڕۆژ کابرا هاتەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) (١٠) درهەمی ئیش کردبوو، ئینجا فەرمووی: دەرۆزە ڕووی پیاوەتی دەبا.

• ٩٤١- **خودا پەرستی کارنەکەر. دەگێڕنەوە:** یاران لەلای پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێکیان کرد کەوا زۆر نوێژکەرو ڕۆژوو گرو قورئان خوێنە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کێ نان‌و ئاوی پێدەدا گوتیان: هەموومان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەمووتان لەئەو چاکترن.

• ٩٤٢- **کارکردن بۆ منداڵی ساوا پەسندە. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کار بە ژن‌و منداڵی ساوا مەکەن، چونکە ژنەکە ئەگەر کارەکەی پێ ئەنجام نەدرا، نەوەك تووشی دامەن پیسی بێ، منداڵیش ئەگەر شتەکەی نەفرۆشرا، نەوەك دزی بکات، فەرمووی: ژن با نان بکاو خوری بریسێ(واتا کاری بە پەنجە بۆ ژنان).

• ٩٤٣- **ئامۆژگاری لوقمان لەبارەی کار. دەگێڕنەوە:** فەرمووی: ڕۆڵە، کاری ڕەوا بکە چونکە، هەر کەسێك کار نەکات‌و هەژار بێ تووشی سێ نەخۆشی دەبێ: یەکەم ئایینەکەی نەرم دەبێ، هۆشی کەم دەبێ، پیاوەتی دەڕوات.

• ٩٤٤- **هەندێ کاری پێغەمبەر(ﷺ). دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆی لەبازاڕ کەلوپەلی خۆی هێناوەتەوە ماڵ، وڵاخی ئالیك داوە، ئاردی لەگەڵ خێزانەکانی لێکردووە ، خۆڵی کێشاوە لەڕۆژی خەندەق، هەتا هەموو سینەی خۆڵو تۆز بوو، خشتی کێشاوە بۆ دروست کردنی مزگەوت، هەروەها دیواری کردووە، لەپاشان منداڵەکانی خالد یارمەتیان داوە، ئەویش نزای بۆ کردوون.

• ٩٤٥- **موسا پێغەمبەر. دەگێڕنەوە:** جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی(القصص)ی دەخوێندەوە. تا گەیشتە باسی موساو شعیب پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: موسا پێغەمبەر لەبەر خاتری خواردنی ڕۆژانەی خۆی‌و دامەنی (٨ یا ١٠) ساڵ شوانەتی کرد. تا شعیب کچەکەی خۆی بداتێ. (ابن ماجە).

• ٩٤٦- **ڕێزی کرێکار لەلای پێغەمبەر(ﷺ). دەگێڕنەوە:** جارێکیان پیاوێکی چوست‌و چاپوك بەلای پێغەمبەر(ﷺ)و یاران تێپەڕی، یاران گوتیان خۆزگە ئەو پیاوە، بۆ غەزا

دەچوو نەك كرێكاری، پێغەمبەر فەرمووی: یاران ئەو پیاوە ئەگەر منداڵی ساوای بەخێوبكا، یا دایكو باوك ئەوەش غەزایە. ئەگەر بۆ ناوو دەنگیش كاربكات ئەوە بۆ شەیتانە. (الطبراني).

- **٩٤٧- عەبدولرەحمانی عەوفو تێكەو لێكە.** **دەگێڕنەوە:** لەو كاتەی عەبدولرەحمانی عەوف چووە مەدینە واتا كاتی كۆچكردن، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سەعیدی رەبیع كردیە دۆستو سەعید گوتی: لەماڵو ژن هاوبەشم بە. كامە ژنی منت دەوێ بۆتی تەڵاق دەدەم. كامە سامانت دەوێ پێتی دەدەم، گوتی: نەخێر تەنها بازێرم نیشان بدە. سەعید بردیە بازێر، لەبازێر وشتری دەكڕیو دەفرۆشت لەماوەیەكی كەم حەفت سەد وشتری قازانج كرد.
- **٩٤٨- پێشەوا عەلی لەجەژنانە.** **دەگێڕنەوە:** جارێ پیاوێ لەجەژنی ڕەمەزان چووە لای پێشەوا عەلی سەیری كرد، وا نانی وشك دەخوا!.
- **٩٤٩- یەكەمین بەندیخانەی موسڵمانان.** **دەگێڕنەوە:** یەكەمین كەسێ بەندیخانەی كڕی پێشەوا عومەر بوو، لەصفوان أمیەی كڕی بە چوار هەزار درهەم.
- **٩٥٠- كەراماتی ئەولیا.** **دەگێڕنەوە:** جارێ پێشەوا عومەر بە حەنزەلە گەیشت گوتی: ئەوە بە گورجی بۆ كوێ دەچیت؟ گوتی: بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوشتێكم هەیە پێم وایە نیفاقە، عومەر گوتی: منیش ئەو ڕەوشتەم هەیە، منیش لەگەڵت دێم كە چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە كە لەلای تۆ دەبین زۆر چاكو باشین كە دەڕۆین، لەبەر گرفتی كارو خێزانو تێكەولێكە دینداریەكەمان وەك ئێستا نیە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێندم بە خودا ئەگەر ئێوە لەهەموو كاتێ وەك ئەوكاتەی لای من بن ئەوا فریشتەی خودا تەوقەتان لەگەڵ دەكا، بەڵام خودا پەرستیەكەی ئێوە دەم دەمیە!.
- **٩٥١- پێشەوا بوخاریو زانستی.** **دەگێڕنەوە:** شەوێك لەشەوان نووسینەوەی دەكرد، چراكەی دەكوژاوەو هەڵی دەگیرساندەوە، نزیكەی بیست جاری خایاند كوژانەوەی چراكەی، ئەوهەڵی دەگیرساندەوە.
- **٩٥٢- نازو نیعمەتی خودا.** **دەگێڕنەوە:** لە الطبراني، نازو نیعمەتی خودا لەلای كۆمەڵە

کەسێك، ئەگەر کاروباری هەژارانیان پێك هێنا ئەوە باشە، ئەگینا خودا نازو نیعمەتەکەیان دەداتە یەکێکی تر.

- **٩٥٣- سکت بە سێ کەس بسووتێ. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان، سکت بە سێ کەس بسووتێ: گەورەیەك گەورێتی نەمابێ، دەوڵەمەندێ هەژار بووبێ، زانایەك نەفام گاڵتەی پێبکەن.
- **٩٥٤- لە پێش لەدایکبوونتان چاکەم کردووە. دەگێڕنەوە:** عەرەبێك بە کوڕەکانی گوت: لەتەمەنی گەورەیی‌و بچووکیتان چاکەم لەگەڵ ئێوە کردووە. هەروەها لەپێش ئەوەی لەدایك بن، گوتیان دەزانین لەکاتی بچووکی، ناوێکی جوانت لێناوین هەروەها لەکاتی گەورێتی چاکەت هەیە، بەڵام لەکاتی پێش لەدایکبوونمان چاکەت چی یە؟ گوتی: دایکێکی چاکم بۆ هێناون.
- **٩٥٥- مرۆڤ‌و فریشتەو شەیتان. دەگێڕنەوە:** لەدانایەك خودا فریشتەی دروست کردووە هۆشیان هەیە، ئارەزوویان نیە، شەیتانی دروست کردووە هۆشی نیە، ئارەزووی هەیە، مرۆڤی دروست کردووە هۆش‌و ئارەزووی هەیە، ئەگەر مرۆڤ زاڵ بێ لەسەر ئارەزوو ئەوە لەفریشتە چاکترە. ئەگینا لەشەیتان خراپترە.
- **٩٥٦- پێنج پرسیارم لە٧٠٠ زانا کرد، یەك وەڵامیان دامەوە. دەگێڕنەوە:** شەقیق ئیبراهیم دەڵێت: ئەم پێنج پرسیارەم لە ٧٠٠ زانا کرد، یەك وەرامیان دامەوە. گوتی: کێ عاقلە؟ گوتیان: ئەوەی دونیای خۆش نەوێ، گوتم کێ زیرەکە؟ گوتیان: ئەوەی دونیا هەڵی فریونێ، گوتم: کێ رژدە؟ گوتیان: ئەوەی بەشی هەژاران نادات، گوتم: کێ زانایە؟ گوتیان: ئەوەی داوای زیادە نەکات.
- **٩٥٧- زەکات بۆ لەش ساغ ناپەسەندە. دەگێڕنەوە:** لەحەجی ماڵئاوایی دوو پیاوی ساغ‌و دەوڵەمەند هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەر(ﷺ) لەو کات زەکاتی دەدا هەژاران، کە تەماشای کردن. لەپاشاندا چاوی هێنایە خوارو فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ زەکاتتان دەدەمێ، بەڵام بەشی دەوڵەمەندو لەش ساغ لەزەکاتدا نییە. (د.ن).
- **٩٥٨- سامانی کیسراو قەیسەر نامێنێ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کیسرا

نامێنێ، قەیسەر نامێنێ. بەو خودایەی گیانی محمدی لەدەست دایە. ئێوە گەنجینەی ئەوان بە زەکات دەدەن لەپێناوی خودا.!

- ٩٥٩- **قەردی مردووی نەبووە لەسەر پێغەمبەرە(ﷺ) دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من بۆ باوەڕداران لەدەروونی خۆیان لەپێش ترم، هەرکەسێك لەوان مرد قەردی لەسەر بوو، نەیبوو بۆی بدەنەوە قەردەکە لەسەر منە، ئەگەر سامانی جێهێشت ئەوە بۆ میراتگری خۆیەتی. (ب.م).
- ٩٦٠- **خێرکردن بە خزمان. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خێرکردن بە هەژاران لەلای خودا پاداشتێکی هەیە، بەڵام ئەگەر خزم بوو ئەوە دوو پاداشتی هەیە: یەکێك لەبەر خزمایەتی، ئەوی تر لەبەر هەژاری.(أ.ت.ن)

- ٩٦١- **پێشەوا مالیك. دەگێڕنەوە:** دەیگوت: زوهد ئەوە نیە سامانت نەبێ، زوهد ئەوەیە خەیاڵی سامان نەکەی، ئەو پیاوە لەشاری پێغەمبەر پێڵاوی لەبەر نەدەکرد، بە سواری وڵاخ نەدەڕۆیشت لەبەر رێزی بەرامبەر پێغەمبەر. دوا وشە کە لەزاری پیرۆزی دەرچوو ئایەتی قورئان بوو (لله الأمر من قبل ومن بعد). پەرتووکەکەی داینا بە ناوی الموطأ، یەکەم پەرتووکە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر کە دانراوە.هۆی دانانی پەرتووکەکەی ئەوەبوو خەلیفە جعفر منصور لەحەج تووشی بوو گوتی: پەرتووکێ دابنێ موسڵمانان سوودی لێ وەربگرن. لەپاشاندا خەلیفە مەهدی لەحەج تووشی بوو، پێنج هەزار دیناری پێدا، هەروەها هەزار دیناریش بە فەقێیەکان، گوتی: پێم خۆشە لەهەموو شارەکانی ئیسلام بڵاوی بکەیەوە، بەڵام مالك رازی نەبوو گوتی: قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرو قسەی هاوەڵان پەرتو بڵاوبۆتەوە. فەتوا بە پێی کاتو شوێن گۆڕانی بە سەر دادێ!! ئەو پەرتووکە نزیکەی چل ساڵ خەریکی بوو، جارێ پرسیاریان لێ کرد ئایا تەڵاقی بە تۆبزی دەکەوێت؟ گوتی: نەء، ئەم قسەیە لەنێو خەڵك بڵاوبۆوە، تا گەیشتە خەلیفە جعفری سلیمان گوتیان مەبەستی مالك هەر تەڵاق نیە، بەڵکە خەلیفایەتی ئێوەش کە بە تۆبزی بوونەتە خەلیفە دروست نییە، بانگی مالیکی کرد، مالك گوتی: بەڵێ خەلیفە هەر شتێ بە

تۆبزی بیّ دروست نییە!

- **٩٦٢- شێوازی تەقوا. دەگێڕنەوە:** لەپیاوێکیان پرسی تەقوا چۆنە؟ گوتی: کەسێك بە ناو دڕکو داردا بڕوات چۆن دەڕوات؟ گوتیان زۆر بە وردیو ئاگاداری گوتی: کەواتە ئەوە تەقوا بوو.
- **٩٦٣- عوتبەی رەبیعەی ئاوانبار. دەگێڕنەوە:** یەکەمین کەس لەجوامێران موسڵمان بوو ئەبو بەکر بوو، لەئەو کات کافرەکان زۆر بەهێز بوون. چونکە دووسیّ موسڵمان هەبوو، لەسەر ئەو زەویە پانو بەرینەدا. بەپیّ بەسەر ئەبوبەکر دەکەوتن. عوتبە بە دوو نەعلەی گەورە لەسەرو ڕووی ئەبوبەکری دەدا. چاوو ڕووی ئەبوبەکر لەیەك دەکرانەوە لەبەر زام، شینو مۆر بوون، ئینجا هەر دەیگوت: پێغەمبەر ماوە. چی بە سەر هات؟!
- **٩٦٤- نێوانی پێشەوا عومەرو کار بەدەستیّ.** دەگێڕنەوە: پیاویّ لەمزگەوت گوتی: قورت بە سەر عومەر بۆ دۆزەخ، پێشەوا عومەر گوتی: لەبەر چی؟ گوتی: سەرکارێکت هەیە لەمصر چ کاریّ تۆ فەرمانی پیّ دەکەی جیّ بەجیّ ی ناکات، پێشەوا عومەر گوتی: ئەگەر ڕاست بکەی سزای دەدەم گوتی: بە دوایاندا نارد، گوتی: لێم گەڕێت دوایی دێمە لای عومەر، گوتیان ئەگەر نێی خانوەکەت بە سەردا دەسوتێنین، هێنایانە لای عومەر، پرسیاری لیّ کرد کابرا گوتی: بەڵیّ وام کردووە عومەر گوتی: کەواتە ئەوە گۆچانو ٣٠٠ مەڕ برۆ ببە شوان هەر کەسیّ ئارەزووی لەشیربوو، با بخوات. جگە لەخێزانی عومەر بابخوات کابرا گوتی: قوربان تەنها ئەمجارە لێم گەڕیّ، جارێکی دی کاری ئاوا ناکەم، جا پاشان عومەر ناردیەوە مصر بووە پیاوێکی چاك.
- **٩٦٥- نێوانی بەندەو شەیتان. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان، ئەگەر زانای بەزانستەکەت خۆت هەڵ مەدەوە، ئەگەر خودا پەرستی دەکەی ڕیایی مەکە، ئەگەر باوەڕت تەواوە واز لەڕای خۆت بیهێنە، ئەگەر لەسەر ئیسلام بەردەوامی، ڕزدو سوور مەبە لەسەر دنیا.
- **٩٦٦- کاری ساناو گران. دەگێڕنەوە:** لەپیاو چاکان، لەهەموو کاریّ پشت بە خودا ببەستە ، ئەگەر گرانیش بیّ، کارەکەت سانایە، بەڵام ئەگەر پشت بە خودا نەبەستی ئەگەرکارەکەت، ئەگەر ساناش بیّ گرانە.

- **٩٦٧- خراپترین کەس. دەگێڕنەوە:** خراپترین کەس زانایەکە زانستی بفرۆشتە کاربەدەستی خراپ، کار بەدەستیش دوارۆژ بفرۆشی بە دونیا.
- **٩٦٨- کێ ئاژەڵە. دەگێڕنەوە:** کەسێك گوێی لەقورئان بێ نەترسێ، تاوانی بە بیر بێتەوە بیر نەکاتەوە، ئامۆژگاری وەرنەگرێ، لەکارەسات دڵ تەنگ نەبێ، لەلای زانایان فێر نەبێ، ئەوە ئاژەڵە.
- **٩٦٩- رەچەڵەکی سەلمان. دەگێڕنەوە:** هەر جارێ بە سەلمانی فارسیان بگوتبوا باوکت کێ یە؟ دەیگوت، ئیسلام چونکە پێغەمبەر پێی فەرموو بوو، سەلمان تۆ لەئێمەی.
- **٩٧٠- سەلاحەددین و کەنیسە. دەگێڕنەوە:** لەدیمەشق کەنیسەیەك هەبوو، پارەیەکی زۆری لێ خەرج کرابوو، بە ناوی کەنیسەی مەریەم، سەلاحەددین نەی هێشت وێرانی بکەن گوتی: خودا فەرموویەتی: تۆبزی کردن لەئیسلام بوون نییە. هەروەها عومەریش وێرانی نەکردووە.
- **٩٧١- سەلاحەددین و بەتریرك. دەگێڕنەوە:** (بەتریرك) قەشە دەبێ، لەکاتی ئازاد کردنی شارەکەی جێ دێلێ یەك مەنجەلی لا دەبێ، پڕ دەبێ لەزێڕ سەلاحەددین دەڵێ، موسڵمانینە دە لێ بگەڕێن، ئەوە پیاوی ئاینە!!
- **٩٧٢- پەیام تەواو بوو. دەگێڕنەوە:** جارێ پێشەوا ئەبو بەکرو عومەر لەپاش مەرگی پێغەمبەر(ﷺ)،چوونە لای (أم أيمن) دەگریا گوتیان لەبەر چیتە ئەم گریانە گوتی: پەیامی خودا تازە تەواو بووا!
- **٩٧٣- رژدی. دەگێڕنەوە:** رۆژێ خوشکی عومەری (عەبدولعەزیز) گوتی: ئەگەر رژدی جل بێ لەبەری ناکەم. ئەگەر رێ بێ پیایدا ناڕۆم، ئەگەر چرا بێ لەبەری دانانیشم.
- **٩٧٤- نێوانی شەیتان و ئادەم.:** لەپیاو چاکان دەگێڕنەوە شەیتان لووت بەرزی کرد لەسەر ئادەم بۆیە نەفرەتی لێ کرا، ئادەم رشت بوو، لەسەر داری گەنم بۆیە لەبەهەشت دەرکرا، (قابیل) حەسوود بوو، بۆیە یەکەم کەس بوو کە مرۆڤێکی کوشت، ئەویش برای خۆی بوو.
- **٩٧٥- هەموو شتێ لەبەر خودابی. دەگێڕنەوە:** جارێ پێشەوا عەلی لەگەڵ کافرێ

ڕووبەڕوی یەکتر بوون، پێشەوا عەلی لەپاش کەمێك کافرەکەی لەعەردی دا، کافرەکە تفی لەپێشەوا عەلی کرد. پێشەوا عەلی گوتی: بەرەڵڵای بکەن، کافرەکە گوتی: لەبەر چی؟ گوتی: ئێستا ئەگەر بت کوژم لەبەر ڕقەکەمە، کافرەکەش لەبەر ئەم قسەیە موسڵمان بوو.

- **٩٧٦- درەخت شایەتی بۆ پێغەمبەر داوە. دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر تووشی عەرەبێ بوو گوتی: وەرە موسڵمان بە گوتی: من **باوەڕت** پێ ناکەم، پێغەمبەر ڕووی لەدارێ کرد بە ناوی داری سومرە، دارەکە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: تۆ پێغەمبەری.
- **٩٧٧- نێوانی عیسا پێغەمبەرو شەیتان. دەگێڕنەوە:** جارێ شەیتان بە عیسای گوت: تۆ دەڵێی ئەوەی خودا نوسیوویەتی دەبێ، باشە بۆ خۆت لەسەر ئەو کێوە فڕێ نادەی؟ عیسا گوتی: هەی نەفرەت لێ کراو خودا دەبێ بەندە تاقی کاتەوە، بەڵام چۆن دەبێ بەندە خودا تاقی بکاتەوە؟.
- **٩٧٨- موسا پێغەمبەرو خودا. دەگێڕنەوە:** جارێ موسا فەرموویەتی: خودایە هۆی چی یە مێشولە واز لەپیاو ناهێنێ؟ خودا فەرمووی: مێشولە دەڵێ خودایە سەری ئەو پیاوە مێشولە بوایە، سەد هەزار مێشولەی دەکەوتێ، هەمووش زکری تۆیان دەکرد.
- **٩٧٩- هاوەڵێکی ئازا. دەگێڕنەوە:** لەجابر فەرموویەتی لەجەنگی (أحد) پیاوێ هەندێ قەسپی لەدەست دابوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر من لەسەر ئایین بکوژرێم پاداشتم چی یە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو: بەهەشت. کابرا لەخۆشیان قەسپەکەی تێ هەڵداو چووە شەڕو شەهید بوو. (م)

**٩٨٠- ئازایەتی ئەبو دجانە. دەگێڕنەوە:** جارێ پێغەمبەر شمشێرێکی لەدەست دابوو فەرمووی: کێ دەیەوێ هەریەکەیان دەیگوت من، لەپاشاندا فەرمووی: کێ هەقی دەدا، تەنها ئەبو (دجانە) دەستی درێژکرد، ئەو فەرمودەیە لەجەنگی أحد بوو، ئەبو دجانە سەری چەند کافری بە شمشێرەکە پەل دا.(م)

- **٩٨١- جۆرەکانی برادەر. دەگێڕنەوە: لەمأمون فەرموویەتی:** سێ جۆرە برادەر هەیە: یەکەم وەك خۆراکە کە لەهەموو دەمێ دەخورێ، دووهەم وەك دەرمانە لەهەندێ دەم بە سوودە،

سێهەم وەك دەردە لەهەموو كاتێ بێ سوودە.

- ٩٨٢- **ئامۆژگاری لوقمـان بـۆ كورەكـەی.** **دەگێڕنـەوە:** جـارێ كورەكـەی گـوتی: باوكـە چاكترین رەوشـت چی یە؟ گوتی: ئایین، گوتی: ئەگەر دوو رەوشت بـوون، گـوتی: ئـایینو سامان، گوتی: سێ بوون، گوتی: ئایینو سامانو شەرم، گوتی: ئەگەر چوار بوون، گـوتی: ئایینو سامانو شەرمو ڕوخۆشی، گوتی: ئەگەر پێنج بوون، گوتی: ئایینو سـامانو شـەرمو رووخۆشیو خێركردن، گوتی: ئەگەر شەش بوون، گوتی: كوڕم ئەوەندە بەسە.
- ٩٨٣- **ئادابی قوربانی لەڕۆژی جەژندا.** **دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: كەسـێك بە تەمای قوربانی بێ، با دە ڕۆژ لەپێش جەژن نینۆكو پرچی نەكات. (م).
- ٩٨٤- **قوربانی نەكردن لەڕۆژی جەژن.** **دەگێڕنەوە:** پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: كەسـێك دەوڵەمەند بێو قوربانی نەكات، با نزیكی نوێژی جەژن نەكەوێت.
- ٩٨٥- **نزای سێ كەس گیرا نابێ.** **دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: نزای سـێ كـەس گیرا نابێ: كەسێك پەلە بكات، نزاكەی تاوانی تیادا بێ، برانی ڕەحمی تیادا بێ. (م)
- ٩٨٦- **سێ كەس تكا دەكەن.** **دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووویـەتی: لـەدوارۆژدا سـێ كەس تكایان گیرایە لەبارەگای خودادا، پێغەمبەران، زانایان، شەهیدان.
- ٩٨٧- **نێوانی پێشەوا عەلیو عومەر بە هۆی زاوایەتی.** **دەگێڕنەوە:** كاتێ پێـشەوا عومـەر كەلسومی كچی پێشەوا عەلی لـەخۆی مـارەكرد گـوتی: خەڵكینـە پـیرۆزەم لـێ بكـەن. ئەوەش ئەوە نیشان دەدا، كەوا نێوانیان بـەهێز بـووەو بـۆ بـەهێزی تـری چـووە بـە هـۆی زاوایەتی.
- ٩٨٨- **نێوانی پێشەوا عومەرو عەلی لەدادگا.** دەگێڕنەوە:پێشەوا عەلی یـەكێ بـوو لـەئـەو ئەنسارو موهاجیرانەی كە عومەر لەكاتی كێشەپرسی پێ دەكردن، بگرە عەلی یەكەم كەس بوو كە پرسو ڕای لێ وەر دەگیرا.
- ٩٨٩- **پێشەوا عومەر حوسێنی خـۆش ویـستووە.** **دەگێڕنـەوە:** جـارێ پێـشەوا عومـەر بـە حوسێن دەڵێ فلان كارم بۆ بكە. ئەویش تووشی عەبدوڵلای عومەر دەبێ، عەبدوڵلا دەڵێ تازە باوكم ئەو كارەی بە من نەكردووە چۆن بە تۆی دەكـات؟ حوسـێن لەبـەر دوو دڵـی

دەگەڕێتەوە لای پێشەوا عومەر. پێشەوا عومەر دەڵێ ها چیت کرد؟ حوسێن دەڵێ تۆبەعەبدوڵڵای کوڕت نەکردووە! عومەر دەڵێ کوڕم تۆ لەلای من خۆشەویستری لەعەبدوڵڵای کوڕم!

- **٩٩٠- ڕێزی عومەر لەلای عەلی. دەگێڕنەوە:** جارێ پێشەوا عومەر بە هەشتاوی دەڕۆیشت عەلی گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ عومەر گوتی: وشترێکی زەکات بزر بووە دەیدۆزمەوە، عەلیش بە دوای کەوت لەگەڵی بدۆزنەوە عومەر گوتی: ئەگەر ڕەشە ولاخێ لەزێی فوڕات بزر بێ، خودا لەڕۆژی دوایی تۆڵەکە لەعومەر وەردەگرێتەوە.
- **٩٩١- پێشەوا عومەر حوسێنی خۆش ویستووە. دەگێڕنەوە:** جارێ بەرگی دا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)تەنها حەسەنو حوسێن مانەوە گوتی: بڕۆن بەرگ بۆ ئەوان لەیەمەن بهێنن، چونکە ئەم بەرگانەی لێرە هەنەبۆ ئەوان دەست نادات.کە هێنایان گوتی: ئێستا دڵم داکەت.
- **٩٩٢- عەلی نزای بۆ عومەر کردووە. دەگێڕنەوە:** جارێ لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆز، پێشەوا عەلی بەلای مزگەوت تێپەڕی گوتی: ئەی عومەر خودا گۆڕت ڕوناك بکاتەوە. هەروەك مزگەوتەکانت ڕۆناك کردەوە.
- **٩٩٣- دانانی ساڵی کۆچی بە هۆی عومەرو عەلی بوو. دەگێڕنەوە:** کاتێ پێشەوا عومەر ویستی ساڵنامەی ئیسلامەتی دابنێ، هەندێ کەس گوتیان با لەسەری ساڵ دەست پێ بکەین، لەئەو ڕۆژەی کە محمد بووەتە پێغەمبەر. یا لەدایك بووە، پێشەوا عەلی گوتی: نەخێر خۆشترین ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە، کە پێغەمبەر لەزەوی کوفر کۆچی کردووە بۆ زەوی ئیسلام، ڕاست پێشەوا عومەر قسەکەی عەلی پەسەند کرد.
- **٩٩٤- نێوانی عومەرو لەبارەی مەعنی زائدە. دەگێڕنەوە:** کاتێ مەعن تەزویری کردبوو لەسەر ئەموستیلەکەی چووبوو پارەی لەخەڵکی کوفە سەند بوو. جا کە گرتیان هێنایانە لای عومەر هەندێ گوتیان: بیکوژە، هەندێ گوتیان لەقنارەی بدە. پێشەوا عەلی دەنگی نەکرد، پێشەوا عومەر گوتی: ئەی باوکی حەسەن بۆ دەنگ ناکەی، گوتی: من دەڵێم لێی بدە، عومەر بە قسەی ئەو لێی داو بەندی کرد.
- **٩٩٥- پێشەوا عومەرو دۆزەخ. دەگێڕنەوە:** دەیگوت: دۆزەخ گەرمیەکەت سەختە، دوورو

قوولی، پڕی لەئاسنی سۆرکراوە.

- ٩٩٦- **هەناسەی دۆزەخ. دەگێڕنەوە:** دۆزەخ لەبەر زۆری گەرما لەبەر خودا پاڕایەوە فەرمووی: خودایە دوو هەناسەم پێ بدە، خودا دوو هەناسەی پێدا یەکێك بووە زستان، ئەوەی تر بووە هاوین.
- ٩٩٧- **گەنجێکی خواناس. دەگێڕنەوە:** جارێ کچە دیانێ حەزی لەکوڕە موسڵمانێ دەکرد. ڕۆژێ گوتی: دەبێ بێیە لام، موسڵمانەکە دەستی لەسەر ئاگر داناو دەستی سووتا. یەکسەر کچەکە زیڕاندیو موسڵمان بوو.
- ٩٩٨- **خۆپاراستن لەدۆزەخ. دەگێڕنەوە:** پێغەمبەر فەرموویەتی: کاتێ بەندە دەڵێ خودایە لەئاگری دۆزەخ بم پارێزە، خودا دەڵێ بەندەی من خۆی پاراستووە بەمن، دەیپارێزم لەئەو داوایەی کە کردویەتی.
- ٩٩٩- **گرانەتا. دەگێڕنەوە: پێغەمبەر فەرموویەتی:** گرانەتا لەهەناسەی دۆزەخە، بە ئاو ساردی بکەنەوە.
- ١٠٠٠- **پیاوچاکێكو گەرماو. دەگێڕنەوە:** جارێ پیاو چاکێ دەچێتە گەرماو هەندێ ئاو بە خۆی دادەکات، بەڵام چ ئاوێ، ئاوێکی گەرم، لەپاشاندا بیر دەکاتەوە کەوا خەڵکی دۆزەخ ئاوەکەیان چەندەها جار گەرمترو پیس ترو بەردەوامترە!!.

## تێبینی/ هێماکان

ب = بوخاری

م = موسلیم

ت = تورمزی

د = ئەبو داود

ن = نەسائی

أ = ئیبن ماجە

سوپاس بۆ خودا بەرگی یەکەم تەواو بوو چاوەڕێی بەرگی دووهەم بن
(انشاء الله)

**ژێـــدەر :**


١ ــ القرأن الكريم
٢ ــ زۆربەی زۆری ژمارەكانی التربية الاسلامية.
٣ ــ التاج
٤ ــ نيل الاوطار
٥ ــ بلوغ المرام
٦ ــ اقوال الصحابة و التابعين.
٧ ــ نزهة المجالس.
٨ ــ الروض الفائق.
٩ ــ ارشاد العباد.
١٠ ــ تنبيه الغافلين.
١١ ــ رياض الصالحين.
١٢ ــ لەگەڵ چەند سەرچاوەیەكی دی.

## چاپکراوەکانی نووسەر بە زمانی عەرەبی و کوردی و فارسی

١- چل چرای رزگاری لەگێڕانەوەی موسلیم و بوخاری ١٩٩٥.

٢- أجمل الحدائق وأبين الحقائق ١٩٩٨.

٣- گەر لەئایینت دەپرسی فەرموو چل فەرموودەی قودسی ١٩٩٨.

٤- ژیانی پێغەمبەران بە قوربان دەرم هێناون لەقورئان ١٩٩٨.

٥- پێغەمبەرو تاوانەکان ١٩٩٨.

٦- پێغەمبەرو نزاو پاڕانەوە ١٩٩٨.

٧- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(١) ١٩٩٨.

٨- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(٢) ١٩٩٨.

٩- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(٣)١٩٩٨.

١٠- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(٤)٢٠٠٠.

١١- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(٥)٢٠٠٠.

١٢- ئەوەتا پۆپەی مەرام بۆ سەرجەم پرسیارو وەرام زنجیرەی(٦) ٢٠٠٠.

١٣- خۆشترین گەشت لەگەڵ ١٠ یاری بەهەشت ١٩٩٧.

١٤- زانستی فەرموودە ٢٠٠٠.

١٥- زانستی قورئان ١٩٩٥.

١٦- سەرگوزشتەی پێغەمبەر ١٩٩٥.

١٧- ژیانی ناوداران ٢٠٠٠.

١٨- خەون نامەی شوانی ٢٠٠٠.

١٩- مەولود نامەی شوانی ٢٠٠٠.

٢٠- پێغەمبەرو تەندروستی ١٩٩٨.

٢١- ئامۆژگاری ٢٠٠١.

٢٢-فەرهەنگی کورد ناسی، ٢٠٠٥

هەردەم لەچاوەڕوانی بەرهەمی نوێ بابن..




چاپی سێیەم




چاپی دووەم

## ئەم کتێبە :

١- ئامۆژگاری، ژێدەری سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانە.
٢- ئامۆژگاری، دەگونجێ بۆ مینبەری هەینی و عەسرانەی ڕەمەزان و گشت کات و دەم.

**نزای دۆست بۆ دۆست،.**

دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((ئەگەر دۆستێ بەپەنهانی نزا بۆ دۆستێکی بکات، ئەوا فریشتەی خودا نزای وەک نزاکەی ئەوی بۆ دەکات)).

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر